بڕیار

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا



94

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

ساڵی هەشتەم
نیسانی ٢٠١٦

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

# بڕیاری ئێوە-هەمیشە بەردەوامە!



## ئاوێنەی دڵ

- نامەیەك بۆ نەوەكەم
- دەرمانخانەی پەروەردەیی
- كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن

## لەگەڵ نامی شاعیردا

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:
مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

No: 94

نیسانی
2016

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـــارس

زاهـیــــر زانـــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەری و دیزاین**

جمال دەروێش

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی: شەقامی سالم -
تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار




**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

**ساڵی هەشتەم - ژمارە 94 - نیسانی 2016**










# کارگێڕیو بازاڕسازی




# بڕیاری ئێوە هەمیشە بەردەوامە!

تا گوڵ بە عیشوە خۆی بنوێنێ‌و تا ئاورنگ ڕووی گوڵ جێ نەهێڵێ‌و تا بولبول لە جریوە نەکەوێ. تا بەفر لە قەندیل مابێ‌و تا سینە هەناسەی تیا بێ، تا یەك خامەی سپی مابێ، تا یەك عاشقی دلگەرمی بڕیار مابێ!

ئەم بڕیارە بەردەوامەو وشە وشەی ئاوێزانی ڕۆحتان دەبێ‌و پەیڤ پەیڤی بە گەردانەی گەردنی بەرزتان دەبێ‌و وەکوو شیرینترین خۆشەویست، دەبێتە میوانی ماڵەکانتان. .

گەر بڕیار نەمێنێ، کێ گوڵاوپرژێنی ڕۆحتان بکاتو لێوتان خەندەباران بکاتو سروەی شادی ببەخشێ بە دڵەکانتان؟!

گەر بڕیار نەبێت، چاوتان بە گزنگی کام خۆری هیوا سورمەڕێژ دەکەن‌و سەری مانگان، لەگەڵ کێدا ژوان دەبەستن!؟

گەر بڕیار نەبێ، کێ بە زمانی ئاوریشم بتاندوێنێ‌و لە گوڵستانی وێژەو ئەدەبدا، شەهدی شیعرو وشەی ناسکتر لە پەڕەی گوڵتان بکاتە دیاری!؟

گەر بڕیار نەبێ، سبەینیان لە سەلسەبیلی چ کانییەك، دەستنوێژی خۆشەویستی دەشۆن‌و ناختان پاك دەکەنەوە!؟

بڕیار دەزانێت ئەگەر سەری مانگێك نەیەتە حزوورتان؛ ئەوا دڵی ئێوە لە خەفەتان دیق دەکاتو لە خەم‌و پەژارەدا نقوم دەبن!

هەربۆیە هەرچیمان کردبێت، ناهێڵین ئێوەو بڕیار لێك داببڕێن!

بڕیاریش هێند دۆستو یارو خۆشەویستی هەن، چۆن ڕێ دەدەن، ئەو چرایە وەکوژێ!!

پڕۆژەیەك هەر لە یەکەم ڕۆژەوە، موڵکداری بەخشراوە بە هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر، هەموو خوێنەرو نووسەرو خۆشەویستێکی بڕیار، خۆی بە خاوەنی دەزانێ‌و بۆ سەرکەوتن‌و پەرەپێدان‌و بەردەوامبوونی بڕیار هەمیشە ئامادەیە.

خۆشەویستان، گۆڤاری بڕیار لەم بارودۆخە پڕقەیرانەدا نەك تەنها بڕیاری بەردەوامبوون دەدات، بەڵکو بڕیاری بەرەوپێشچوون‌و نوێخوازی‌و پڕۆژەی نوێ دەداتو لە ڕێگای (ڕێکخراوی بڕیار گرووپ بۆ ڕاگەیاندن‌و گەشەپێدان)ەوە، بە کۆمەڵێك پڕۆژەی نوێوە، دێتە خزمەتتان.

چاوەڕوانی بەردەوامی‌و هاوکاری یەکە بە یەکەی ئێوەی بەڕێزین، بۆ هەر جۆرە هاوکاری‌و پێشنیارو خزمەتێك، بەم پڕۆژە گەورەیەی کە ئامانجی دروستکردن‌و بنیاتنانی تاکی کوردو کۆمەڵگەی کورردەوارییە، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بڕیارەوە بکە، لەڕێگەی ئیمێڵی sarnosar@yahoo.com یاخود بە نامەیەك بۆ facebook: BryarMagazine

هەروەها ڕۆژی ٢٠١٦/٤/٥ لە پێشانگای نێودەوڵەتیی کتێب لە هەولێر، لە خانەی G3 لە خزمەتتانداین.

# كارگێڕی بە گوفتار

پشوودرێژی، واتە: لەو کەسە ببووریت، کە ستەمی لێکردوویت، وەڵامی خراپەش بە چاکە بدەیتەوە.

لوقمانی حەکیم

ژیان کورتە، بەڵام بەڵاو ناڕەحەتییەکان، درێژی دەکەن.

بوبلیلیۆس سیرۆس

لەگەڵ ئەوانەی خوار خۆتەوەن، بەبەزەیی بە..
ئەوەی لە سەروو خۆتەوەیە، لەگەڵتدا بەبەزەیی دەبێت.

پەندێکی عەرەبی

سینەی مرۆڤ خەزێنەی نهێنییەکانە، لێوەکانیش قوفڵی نهێنییەکانە، زمانیش کلیلی نهێنییەکانە، پێویستە هەموو کەسێك، پارێزگاری لە کلیلی نهێنییەکان بکات.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

توڕەبوون بایەکی بەهێزە، ڕووناکی چرای عەقڵ دەکوژێنێتەوە.

ڕۆبێرت ئنجرسۆڵ



# پێشبڕکێ لە بەخشندەییدا!

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، ناسراو بوو بە کەسێکی بەخشندەو ناوبانگی بە بەخشندەییو سەخاوەت، دەرکردبوو، لە یەکێك لە گەشتەکانیدا، ڕێی دەکەوێتە نێو باخێكو لەوێدا چاوی بە کۆیلەیەکی ڕەشپێست دەکەوێت، کە پاسەوانو باخەوانی بوو، سەرنجی دا، کاتێك (٣) کولێرەیان هێنا، بۆ کۆیلەکە؛ بۆئەوەی لەبری نانی نیوەڕۆ بیخوات، لەو کاتەدا سەگێکی ڕەش پەیدابوو، بە هەنسکەبڕکێ لە کۆیلەکە نزیك بوویەوە، ئەویش کولێرەیەکی بۆ هاویشتو سەگەکەش خواردی، دواتر کولێرەی دووەمی بۆ هەڵداو ئەویشی خوارد، لە کۆتاییدا کولێرەی سێیەمیشی بۆ هەڵداو ئەویشی خوارد!!

عەبدوڵڵا لێی پرسی: ئەرێ تۆ خواردنی ڕۆژانەت چییە؟

گوتی: ئەوەی کە دەیبینیت.

عەبدوڵڵا لێی پرسی: ئەی بۆچی خۆت نەتخواردو دەرخواردی سەگەکەت دا!؟

کۆیلەی پاسەوان گوتی: ئەم سەگە لێرە نامۆو ئاوارەیەو سەگی ئەم ناوچەیە نییەو لە شوێنێکی دوورەوە هاتووەو هەستم کرد زۆری برسییەو حەزم نەکرد بە برسێتی بیهێڵمەوەو نائومێدی بکەم!

لێی پرسی: ئەی ئەمڕۆ چی دەخۆیت؟

گوتی: بەڕۆژوو دەبمو هیچ ناخۆم

عەبدوڵڵاش لە دڵی خۆیدا گوتی: خەڵکی هەموو باسی بەخشندەیی من دەکەن، بەڵام ئەم غوڵامە، لە من بەخشندەترە!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- بەخشندەیی سیفەتێکی بەرزی مرۆڤە چاکەکانەو جێگای فەخرو شانازیی هەمیشەییە!

٢- بەخشندەیی سیفەتێکی هێندە جوانو خۆشەویستە، کە خەڵکی هەرگیز ناوی بەخشندەکان لەیاد ناکەنو لەدوای مردنیشیان یادو یادەوەرییان زیندوو دەمێنێتەوە.

٣- بەخشندەییو میهرو بەزەیی، مرۆڤ دەکاتە ساباتی سۆزو بەزەیی بۆ هەموو گیانداران، ئەگەر سەگێکی برسیش بێت، چ جای مرۆڤێکی وەك خۆی!

٤- مرۆڤی بەخشندە، خودپەرستی وەلا دەنێو بەرامبەر ئازارو برسێتیی کەسانی دی، خۆی لەیاد دەچێت!

٥- چەند گەورەن ئەو مرۆڤانەی پێشبڕکێ دەکەن لە بەخشیندا، ئاواتەخوازن کەس نەیانگاتێو هەمیشە پێشەنگ بنو بێسنوور ببەخشن، لە بەرامبەریشدا کەسانی چرووكو ڕەزیل زۆر بچووكو قێزەونن؛ چونکە توانای بەخشینیان نییەو ئەگەر بە بەرچاویانەوە مرۆڤەکان بمرن؛ ناتوانن دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن!

٦- ئەو غوڵامە غیرەتو سۆزی مرۆڤانەی قەبووڵ ناکا، سەگێکی برسی، میوانی بێتو تێری نەکات، خۆی بەڕۆژوو دەبێت، بەڵام ڕۆزیی هەموو ڕۆژەکەی، دەرخواردی ئەو دەدات!!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

مالێکی بەختەوەرم پێ بدە، نیشتمانێکی بەختەوەرت پێ دەبەخشم.
عەباس مەحموود عەققاد

01

سەرچاوەی ئازایەتی، بیرکردنەوەیە.
ناپلیۆن پۆناپارت

02

ئەوکەسەی مێژوو نەخوێنێتەوە، بە درێژایی ژیانی، بە منداڵی دەمێنێتەوە.
شیشرۆن

03

ناتوانیت ببیت بە پاڵەوان، گەر ترس تاقی نەکەیتەوە.
بەرناردشۆ

04

ئەو کەسەی لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، جیهان وەکوو ئەو کاتە دەبینێت، کە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بینیویەتی.. ئەو کەسە سی ساڵ تەمەنی بەفیرۆ چووە!

05



سەلیقەی کارگێڕی

# ڕەوشتو ئاکاری سەرکردە

بەشی دووەم

### سەرکردە دڵسۆزە

دڵسۆزیو پشتیوانی، هەردوو لە سامانو دارایی دەچن، گەر بەتەمایت دەستت بکەوێت؛ پێویستە تۆزێکی لێ خەرج بکەیت.. یان هەردووکیان وەك میهرو بەزەیی وان، گەر ویستت بەدەستی بهێنیت؛ ئەوا بەر لەوە دەبێت، بە کەسانی دیکەی ببەخشیت.

لەبەردەم کارمەندەکانتدا، پێویستە لە شانوشکۆو پلەوپایەی کۆمپانیاکەت کەم نەکەیتەوە؛ چونکە لای ئەوان، تۆ کۆمپانیاکەیتو کۆمپانیاکەش تۆیت، بەڵام ئاگات لەوە بێت، ئەم یاسایە، چەکی دوو سەرەیە، لەبەر ئەمەیە، گەر دەتەوێت وەختێك پێویستت پێیان بوو، یارمەتیت بدەنو بەدڵفراوانی کار بکەن؛ ئەوا دەبێت لە پێناوی کۆمپانیادا، سووکایەتی بە کارمەندەکانت نەکەیت، خۆ گومانیش لەوەدا نییە، پێویستیت پێیان دەبێتو هەر ڕێت تێیان دەکەوێت.

### سەرکردە گەشبینە

سەرکردەی گەشبین، لە گوێڕاگرتن لە کەسانی دیکەو بیروبۆچوونیان خۆشی دێت؛ چونکە هەردەم پێشبینی هەواڵێکی خۆش دەکات، بەڵام ڕەشبین گوێی خۆی کەڕ دەکات؛ چونکە بەردەوام چاوەڕێی هەواڵی ناخۆش دەکات.

گەشبین وەك سەرچاوەی سوودو قازانج، هەروەها وەك داهێنەرو بەرهەمهێنەر، لە خەڵکی دەڕوانێت. هەرچی ڕەشبینیشە، بە سەرچاوەی پەستی، هەروەها بە تەمبەڵو هەڵەخەرجیان دێتە بەر چاو.

بەڕاستی سەیرە، کە دەتوانرێت لە کۆتاییدا، ڕاستیو درووستیی هەر یەك لەم دوو تێڕوانینە بسەلمێنیت، بەجۆرێك ئەوەی باسی داهێنانی کردووە؛ داهێنان دەکات.. ئەوەشی خەڵکی بە تەمبەڵی تۆمەتبار کردووە؛ تەمبەڵی دایدەگرێت.

گەشبین، بەوپەڕی متمانەو ئاواتەوە، بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستێت.

بەڵام ڕەشبین، هەتا بۆی بلوێت، لە نوێنو جێخەوەکەیدا دەمێنێتەوەو دەڵێت: خواردنو خەو کارمە، خودا ئاگادارمە.

گەشبین، پێشوازی لە هەموو ئەو بیرۆکەو بۆچوونانە دەکات، کە کارمەندەکانی دەیخەنە ڕوو.

ڕەشبینیش، بە چاوی گومانەوە، چاو لە هەموو بیرۆکەو بۆچوونێکی تازە دەکات، هەروەها بە چەند بیرۆکەو بۆچوونێك تەماشایان دەکات، کە ئەوەی بنچینەی سەرکەوتن بێت، تێیاندا نییە.

کەوابوو: سەیروسەمەرە نییە، گەشبین بەرەو پۆستە بەرزەکانی کۆمپانیا بەرز ببێتەوەو گەشبینیش هەر لە جێی خۆیدا بێتو نەگۆڕێت، وەك کورد دەڵێت: گا هەر لە پێستی خۆیدا دەمێنێتەوە.

### سەرکردە خەڵکی خۆش دەوێت

وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە، بەمەرجگرتنی ئەم ئاکارە سەرەتاییە لە سەرکردەدا، بێپاساوو ناپێویست دەردەکەوێت.. کاتێك بەڕێوەبردنی خەڵکیو هەڵکردن لەگەڵیاندا، بووە بە ئەرکی سەرەکیی سەرکردە، خۆ ئەگەر ئەوانی خۆش نەوێت؛ ئەوا چۆن دەتوانێت، ئەو ئەرکە، بەباشی ئەنجام بدات؟

سەرکردە هەرەچاکەکان، بایەخ بە هەموو ئەوانە دەدەن، کە کاریان لەگەڵدا دەکەن.. بەچەشنێك بایەخدانێکی ڕاستەقینە، بە گشت ئەو کارانەی کارمەندەکان ئەنجامیان دەدەن، دەردەخەن.. ئەمەش وا لە کارمەندەکان دەکات، دڵیان بە خۆیانو سەرکردەکانیان خۆش بێتو ڕازی بن. سەرباری ئەوەش، سەرکردە سەرکەوتووەکان، کۆسپو لەمپەر لەنێوان خۆیانو کارمەندەکانیاندا دانانێنو دەرگاش بە ڕوویاندا داناخەن.

باشترین کارگێڕەکانیش، ئەو کەسە ئاساییانەن، کە تێ دەگەن، ئەوان لە تێکڕای خەڵکی باشتر نینو خاڵە لاوازەکانیشیان دەناسن، کە وایان لێ دەکات، لە خاڵە لاوازەکانی ئەو کەسانەی لەژێر سەرکردایەتیی ئەواندا کار دەکەن، تێ بگەنو سەرودەر بکەن.



ن: عبدالله العثمان     و: جەلال عەبدوڵڵا

# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

## ٣١-کەمکردنەوە، یان وازهێنان لە تاوان

هەموو مرۆڤێك هەڵە دەكات، بەڵام باشترین هەڵەكار ئەو كەسەیە، كە تەوبە دەكات، تاوان ژیانی مرۆڤ داگیر دەكات، لە كاتی تاواندا، كاتەكەی بەشتی بێسوود بەفیڕۆ دەداتو دواتر پەشیمان دەبێتەوە، هەروەها بەدوای خۆیدا، كاریگەریی زۆر جێ دەهێڵێت، نەهێشتنی بەرەكەت، هەژاری، هەست بە تەنگانەو دووركەوتنەوەی خەڵكی لێی. مرۆڤ دەبێت هەوڵی كەمكردنەوەی تاوانو زۆركردنی خواپەرستی بدات، هەروەها دۆزینەوەی چارەسەری بەسوود؛ بۆ كەمكردنەوەو دووركەوتنەوە لە تاوانو داوای لێخۆشبوون، تەوبەكردنی ڕاستەوخۆ لەپاش تاوان؛ تا تاوان، چیدی لەوە زیاتر، نەبێت بەهۆی بەفیڕۆدانی كاتەكانی.

## ٣٢- لە كاتی تەنگانەدا ئامادە بە

هەركەسێك لەكاتی تەنگانەو ناڕەحەتیدا، لەگەڵماندا بوەستێت، لەلای ئێمە بەنرخەو لەبیرمان ناچێتەوە، ئەگەر بەگوێگرتنیش بێت، بە كەسێكی بەوەفای دادەنێین، وەستان لە كاتی تەنگانەدا، هۆكارێكە بۆئەوەی خەڵكی تۆیان خۆش بوێت، لە دڵەكاندا شوێنەوار بەجێ دەهێڵێت، ئەوان لە تەنگانەدا هەست بە تەنیایی دەكەن، بە وەستانت لەگەڵیاندا، ئەو هەستەیان پێ دەبەخشیت، كەسێك هەیە گوێیان لێ دەگرێتو گرنگییان پێ دەداتو ئەو گرفتەی بەسەریان هاتووە، هاوبەشە تێیدا، مرۆڤ لە كاتی تەنگانەدا، پێویستی زۆری بە یارمەتیو چارەسەركردنی كێشەكانی نییە، بەڵكو پێویستی بە گوێلێگرتنو لێكگەیشتنو هاوسۆزی هەیە.

(واتە: لەخەمەكانت هاوبەشیم پێ بكە، هەمووی بەتەنیا مەخۆ، ڕەنگە بەرگە نەگریت ."وەرگێڕ")

## ٣٣- نەخشەی زیهنی

نەخشەی زیهنی لە زانستە تایبەتو كاریگەرەكانە، بەكورتی ڕێگەیەكە بەلای مێشكەوە پەسەندە، بۆ نووسینو كورتكردنەوە، دەتوانیت زۆرشت كورت بكەیتەوە لە لاپەڕەیەكدا، نەخشەی زیهنی لەیەك كاتدا بەشی ڕاستو چەپی مێشك چالاك دەكات، مەنتقو ژمارەو وێنەو ڕەنگی تێدا بەكاردەهێنرێت، كاتێكی زۆرمان بۆ دەمێنێتەوە، دەتوانیت چیت پێیە بیخەیتە سەر پەڕەیەك، بەكارهێنانی زۆری هەیە، واباشترە بەشداری خولێك بكەیت لەم بوارەدا، لە هەموو بوارەكانی ژیانتدا بەكاری بهێنە.

## ٣٤- ڕوانین بۆ خود

چۆن سەیری دەروونی خۆت دەكەیت، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە سەیری تۆ دەكەن، چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خۆتدا دەكەیت، ئەوانی تریش بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵدا دەكەن، چۆن چاوەڕێی ئەوە دەكەیت بەسەرتدا دێتو بیری لێدەكەیتەوە، لێت ڕوودەدات، كاتێك وەك كەسێكی شڵەژاو سەیری خۆت دەكەیت، دڵنیابە ژیانت پڕدەبێت لەكێشە، پێچەوانەكەشی ڕاستە، ئەگەر خۆت بە دامەزراوو ڕێكبینیو حەزت لە ڕێكوپێكیە، ئەوا خەڵكی بەم چاوەوە سەیری تۆ دەكەن، كاردەكەیت بۆ ڕێكخستنو چاككردنو بەڕێوەبردنی ژیانت، بەهای خۆت بەرز ڕابگرەو ڕێزی لێبنێ، زۆر گرنگترە لەوەی تۆ پێشبینی دەكەیت.

## ٣٥-كاتێك بۆخۆت تەرخان بكـــــــە

كاتێك بۆ خۆت تەرخان بكە پاش سەركەوتنو ئەنجامدانی كارێك، بۆ دەمەزەردكردنەوەی ژیانتو بەرزكردنەوەی ورەو لایەنی ڕۆحی، حەسانەوە پاڵنەرە بۆ كاری گەورەتر، وادەكات بەهیممەتو ڕۆحێكی گەورەترەوە بگەڕێیتەوە، وەك لاستیك ئەگەر ڕایبكێشیت بەهێزێكی زیاترەوە دەگەڕێتەوە، مرۆڤیش بەهەمان شێوە كاتێك لە شوێنی كار دووربكەوێتەوە، بەهێزێكی زۆرەوە دەگەڕێتەوە، هیممەتێكی تری هەیەو قەرەبووی كاتی لەدەستچوو دەكاتەوە، پشوو بە خوودی خۆتان بدەن، ئاهێكی بەبەردا بكەنەوەو چالاكیەكان بگۆڕن بۆ ئەوەی بێزار نەبێت.



پــلان

سامان کەریم

بەشی هەشتەم

# کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

ئەوەی پێشتر باسمان کرد، بریتی بوو لە خشتەی بەرنامەی بەکارهاتوو، بۆ پلانەکەمان بەو بەرنامە تەکنەلۆجییەی کە کارەکەی پێ جێبەجێ دەکەین، ئێستا دێینە سەر تەواوکاریی پلانەکە، بۆ هەموو ئەو کارانەی کە ماوە، لەگەڵ میکانیزمی جێبەجێکردنی پلانەکەو چۆنێتیی جێبەجێکردنی پلانەکە، واتە: حکومەت چۆن ئەم پلانە جێبەجێ بکات.

دەگەڕێینەوە بۆ شێوازەکانی فۆرم:

پێشتر باسی فۆرمی خێزانیمان کرد، ئێستا باسی فۆرمی دووەم دەکەین کە فۆرمی تاکەکەسییە.

٢. فۆرمی تاکەکەسی

ئەم فۆرمە هەمان فۆرمی خێزانییە، بەڵام کەمێك جیاوازی هەیە لە شێوازەکەیدا، هەندێك خاڵیش لێرە دەنووسینو هەندێك خاڵ، پێویست بەنووسین ناکات.

بەڵام جیاوازییەکەی لەگەڵ فۆرمی خێزانیدا ئەوەیە، کە ئەم فۆرمە، تایبەتە بەهەر تاکێك بەسەرۆکخێزانیشەوە، هەروەها ئەم فۆرمە بیۆگرافیای هەموو تاکێکە، لە خشتەی پێشوو ئەم فۆرمە دروست دەکرێت.

لە خشتەکەدا، هەر بەشێك پێویست بێت، زیادی دەکەین بۆ ئەم فۆرمە؛ لەبەرئەوەی ئەم فۆرمە بۆ هەموو تاکێکە، هەر لەگەڵ ئەم فۆرمەدا، فۆرمێکی ترمان دەبێت، کە تایبەتە بەهەمان کەس، کە ناسنامەو ڕەگەزنامەو کۆبوونی خۆراكو بڕوانامەی خوێندنی ئەو کەسە، بۆ هەر مامەڵەیەکی فەرمانگەکان، لەخۆ دەگرێت..

## پێداویستیی گشتی بۆ ئەم پلانە

پێداویستییە گشتییەکان بۆ ئەم پلانە، دەبن بەسێ بەشی سەرەکییەوە:

* پێداویستیی کارگێڕیو ئیداری .
* پێداویستیی هاوڵاتی.
* پێداویستییەکانی لایەنی جێبەجێکار (حکومەت).

### یەکەم: پێداویستیی کارگێڕیو ئیداری:

مەبەستمان لە پێداویستیی کارگێڕیو ئیداری چییە؟

مەبەستمان پێی، ئەو پێداویستیانەیە، کە دەبێت حکومەت دابینی بکات، وەك:

پەڕاوگە: هەموو جۆرەکانی پەڕاوگە، بەپێی پێویستیی پلانەکە، هەر لە کاتی جێبەجێکردنی پلانەکەوە، تاکوو بەئەنجامگەیشتنی پلانەکەو کۆتایی هاتنی پلانەکە.

ئۆتۆمبێل: بۆ هاتوچۆی ئەو کارمەندانەی، کە لەم پلانەدا کار دەکەن.

ئۆفیسی سەرەکی: بۆ هەر پارێزگایەك، دەبێت ئەم ئۆفیسە هەبێت، تاکو کۆتایی پلانەکە.

کابینە: بۆ هەموو ناوچەیەکی نیشتەجێبوونو گەڕەکەکانی نیشتەجێبوون، تاکو کۆتایی.

تەلەفۆنو هێڵی ئینتەرنێتو کۆمپیوتەر: بۆ هەموو ئۆفیسو کابینەکان، بۆ پەیوەندیی بەردەوام، بۆ هەر کێشەیەك کە دروست دەبێت، لە کاتی جێبەجێکردنی پلانەکەدا.

تێبینی: لەئێستادا بە هۆی ئەو بارە داراییەی کە ڕووی لە هەرێم کردووە، دەتوانین زۆرێك لەمانە نەکەین بە خاڵی سەرەکی، بەڵکو بەدیلەکانیان بەکار بهێنین، بەڵام هەندێك پێداویستی، هەر دەبێت هەمان بێت؛ بۆ سەرکەوتنی کارەکەمان، لەوانە: پەڕاوگە پێداویستییەکی حەتمییە، بەڵام دەتوانین بەپێی پێویستی، بەکاری بهێنین، ئۆتۆمبێل دەتوانین هەر ناوچەیەکی نیشتەجێبوون کارمەندی ئەو شوێنەی بۆ بنێرینەوە، یان نزیك لەشوێنی نیشتەجێبوونی خۆی؛ بۆئەوەی ئەم لایەنەش نەبێت بە کێشە، بۆ ئۆفیسە سەرەکییەکان، دەتوانین شوێنی حکومی بەکاربهێنینو بۆ کابینەکان دەکرێت سوود لە خوێندنگاو مزگەوتو ئەو شوێنانە وەربگرین کە دەتوانین بەکاریان بهێنین، هەروەها تەلەفۆنیش لەکاتی زۆر پێویستدا بەکار بهێنین. بەم جۆرە، بڕێکی زۆر لەم کێشانەش ناهێڵین کە ببێتە هۆی پەکخستنی کارەکەمان لەڕووی داراییەوە.

### دووەم: پێداویستییەکانی هاوڵاتی:

مەبەستمان لە پێداویستییەکانی هاوڵاتی چییە؟

مەبەستمان پێی، ئەو پێداویستییانەیە کە داوادەکرێت لە هاوڵاتیان لە ڕێگەی سەرۆك خێزانەوە دەهێنرێت بۆ ئەو شوێنەی کە بۆ هەرناوچەیەکی نیشتەجێبوون دیاری دەکرێت، وەك:

کۆبوونی خۆراك: چەند کۆبوونی خۆراك لەو خێزانەدا هەبێت حسابی ئەوەندە خێزانی بۆ دەکرێت، مەبەستمان پێی

ئەوەیە کە هەندێك جار کوڕی گەورە لەگەڵ ماڵی باوکیدا دەژی لەبەرئەوەی شوێنێك بەکرێ نەگرێ، ئەمە یارمەتیمان دەدات کە ئاماری ئەو خێزانانە بزانین کە لەماڵی باوکدا نیشتەجێن بۆ ئەوەی لەڕێگای پلانی ئاوەدانکردنەوەوە کێشەی کرێ نەهێڵین.

ناسنامەی باری کەسی: بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەژیاندانو بوونیان هەیە لە کوردستاندا، بۆئەوەی ئاماری ڕاستەقینەی هاوڵاتیانی هەرێم بزانینو لەسەر ئەو ژمارەیە، دەست بکەین بە چارەسەرکردنی کێشەکان.

ڕەگەزنامە: دیارە هەموو ئەو هاوڵاتییانە دەگرێتەوە، کە خەڵکی هەرێمی کوردستانن.

وێنەی بچووك: بۆ هەموو ئەندامانی خێزان، بە قەبارەی وێنەی جەواز، دەبێت وێنەکەش تازە بێت؛ چونکە ئەم وێنەیە دەدرێت لەو ناسنامەیەی کە جێگەی هەموو ناسنامەکان دەگرێتەوە لە داهاتوودا.

بڕوانامە: بڕوانامەی کۆتاپلەی خوێندن، بۆ هەموو ئەندامانی خێزان. لەگەڵ گۆڕینی بڕوانامە بەبەرزتر، بڕوانامەی تازە دەهێنرێت، لەچەند بواردا بڕوانامەی هەبوو، دەتوانێت پێشکەشی بکات.

پشتگیریی شوێنی نیشتەجێبوون: دیارە ئەمە تەنها سەرۆکخێزان دەگرێتەوە، بۆ ئەو خانووەی کە لێی نیشتەجێیە.

تێبینیی گرنگ: بۆئەوەی ئەم پلانە ڕاستو درووست دەربچێت، دەبێت بەشێوەیەکی ڕاست زانیارییەکان پێشکەش بکرێن، ئەگەر نا، ئامار لەسەر بنەمای درۆ درووست ناکرێت، بۆ ڕاستیتیی کارەکەشمان، لەدوای وەرگرتنی زانیارییەکان، کاری پشکنین بۆ ڕاستیی زانیارییەکان دەست پێ دەکەین، کە زۆر گرنگە؛ بۆئەوەی پلانەکەمان ڕاست بێتو دوور بێت لە هەموو جۆرە هەڵەیەك، هەرکەس بەشێوەیەکی هەڵە، زانیاری پڕ کردبۆوە، دەکرێت بێبەش بکرێت لەو ناسنامەیەی کە جێگای هەموو ناسنامەکان دەگرێتەوە لە داهاتوودا.

سێیەم: پێداویستیەکانی لایەنی جێبەجێکار:

مەبەستمان پێی ئەو زانیاریانەیە کە وەك فۆڕم دەدرێت بەهەر سەرۆك خێزانێك، دوای پڕکردنەوەی لەو ماوەیەی کە دیاریکراوە دەگێردرێتەوە بۆ شوێنی مەبەست، وەك:

١. لیستی تۆمار: ئەم لیستە وەك تۆماری سەرەتایی ناوی سەرۆك خێزانەکان لەو ناوچەی نیشتەجێبونە تۆمار دەکرێتو داخڵی کۆمپیوتەر دەکرێت، بۆ چێك کردنەوەی هەموو خێزانێکی ناوچەکە بەم شێوازەی خوارەوە:

"ژمارە- ناوی چواری- مۆبایل- شوێنی نیشتەجێبوون- ژمارەی ئەندامانی خێزان- تێبینی"

٢. فۆڕمی زانیاری: ئەم فۆڕمە دروست دەکرێت دوای ئەوەی کە بڕیار لە جێبەجێکردنی ئەم پلانە درا، دەدرێت بەهەر سەرۆك خێزانێك بۆ پڕکردنەوەی، بەڵام فۆڕمی سەرۆك خێزان لەگەڵ فۆڕمی ئەندامانی خێزان کەمێك جیاوازی دەبێت، بەهۆی بەرپرسیارێتی زیاتری سەرۆك خێزانەوە، واتە ئەم فۆڕمە دوو جۆرە:

یەکەم: فۆڕمی سەرۆك خێزان.

دووەم: فۆڕمی ئەندامانی خێزان.

٣. زەرفی گەورە: ئەم زەرفە دەدرێت بەهەر سەرۆك خێزانێك کە لیستی پێداویستی داواکراو لەگەڵ فۆڕمەکانی (خێزانیو ئەندامان)دا دەدرێت پێی. دوای پڕکردنەوەو تەواوکردنی لەو ماوەیەی کە دیاری دەکرێت پێداویستیەکان دەخاتەوە ناو ئەم زەرفەو زەرفەکەش ئەم زانیاریانەی لەسەر دەبێت:

کۆدی شوێنی نیشتەجێبوون: (کۆدی هەشت ژمارەیی)

ژمارە: (ژمارەی ڕیزبەندی خێزانی)

"ناوی چواری- ژمارەی ئەندامانی خێزان- شوێنی نیشتەجێبوون: (١. پارێزگا، ٢. قەزا، ناوەند، ٣.ناوچە، ٤. گەڕەك، ژمارەی مۆبایل)".

هەر یەکێك لەم زەرفانە دەدرێتە هەر سەرۆك خێزانێکی ئەو شوێنی نیشتەجێبونەو لەکاتی تەواوکردنی پێداویستیەکانیدا دەیگێڕێتەوە بۆ کابینەی ئەو گەڕەکەی کە لێی وەرگرتووەو لەدوای ئەم کارە کرداری چێککردنەوەی زانیارییەکان ئەنجام دەدرێت.

میکانیزمی جێبەجێ کردن:

یەکێك لە گرنگترین بەشەکان بریتیە لە میکانیزمی جێبەجێکردن، هەر پلانێك چەند بەهێز بێت میکانیزمی جێبەجێکردنی هێزی پلانەکە زیاتر دەکات، چونکە هەموو پلانێك پێویستی بەوەیە چەند بەبەهێزی دارشتنی بۆ دەکرێت ئاوهاش بەبەهێزی جێبەجێ بکرێت، لەبەرئەوەی پلان وەك ئەڵقەیەکی پێکەوەیی وایە دەبێت هەموو بەشێکی پلانەکە گرنگی خۆی پێ بدرێت، ئەگینا ئەوەندەی دەبێتە پلانێك بۆ سەرفکردنی بودجەو کات نابێتە پلانێکی بەسود بۆ هاوڵاتیان.

ڕێگاکانی میکانیزمی جێبەجێکردن

ئەم پلانە بەشێوەیەکی گشتی بەم سێ ڕێگا سەرەکیە جێبەجێ دەکرێت:

یەکەم: ڕێگای پێدانی فۆڕمی زانیاریو پڕکردنەوە: دەبێت لەماوەیەکی دیاریکراودا کە لە (١٥) ڕۆژ بۆ (٣٠) ڕۆژ مۆڵەت بێت بۆ پڕکردنەوەی زانیارییەکانو گێڕانەوەی بۆ شوێنی مەبەست.

بەو شێوازەی کە ئاماژەمان پێکرد هەر سەرۆك خێزانێك فۆڕمەکان وەردەگرێت بۆ پڕکردنەوەو گێڕانەوەی لەگەڵ ئەو پێداویستیانەی کە داوای لێکراوە، وەك ناسنامەو ڕەگەزنامەو کۆبونی خۆراکو پشتگیری شوێنی نیشتەجێبوونو وێنەی بچوكو بڕوانامەی تاکەکەسی.

دووەم: ڕێگای پشکنینی زانیاریو پێداویستی هاوڵاتیان: دوای ڕێگای یەکەم ڕاستەوخۆ ئەم ڕێگایە دەگرینە بەر بۆ ئەوەی چێکی ئەو زانیاریانە بکەینەوە کە هاوڵاتیانی ئەو ناوچانە گەڕاندویانەتەوە بۆ ڕاستیو دروستی زانیاریەکانو ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، ئەم ڕێگایە بەپێی قەرەباڵغی شوێنی نیشتەجێبونەکە دەردەکەوێت چەندی پێ دەچێت، بەڵام دەبێت ماڵ بە ماڵو بۆ هەر ئەندامێك ئەم کرداری چێك کردنەوەیە بکرێت بۆ ئەوەی پلانەکە بەباشی جێبەجێ بکەین.

سێیەم: ڕێگای داخلکردنی زانیارییەکانو دروستکردنی ئامارەکە: دوای ئەوەی هەردوو ڕێگای پێشومان بەسەرکەوتوویی ئەنجامدا، بەم ڕێگایە ئامارەکە دروست دەکەینو دەبینە خاوەنی ئاماری زانستی بۆ هەموو بوارەکان، ئەم ڕێگایەش بەکەسانی پسپۆڕو شارەزا لەو بەرنامە تەکنەلۆجیەی کە کاری پێ دەکەین دەکرێت، هەروەها کاتی ئەم ڕێگایەش تا ڕادەیەك لێهاتووی کارمەندانی ئەم بەشە دەتوانن دیاری بکەن، بۆیە ئاستەمە بتوانین بە دەقیقی کاتەکەی دیاری بکەین.



بەشی دووەم

حامید حسێن

# خۆت ژمێریاری خۆت بە !

**چۆن بە هۆشمەندیی بازرگانی، بەهرەی سەرمایە باشتر بکەین؟**

لەم ساڵانەی دواییدا، بانگەشەیەکی زۆر، لەبارەی بەکارهێنانی هۆشمەندیی بازرگانی (Business Intelligence، یان BI) لە کارو کەسابەتدا درووست بووە. کۆمپانیاکان خەریکی سەرمایەگوزاری ملیۆن دۆلاری لە تەکنۆلۆژیای هۆشمەندیی بازرگانیدان، بەڵام ئەگەر ئەم سەرمایەگوزارییە، نەبێتە هۆی بنامایەکی بەهێز بۆ کارو کەسابەتی هۆشمەند؛ ئەوا بە کردەوە دەسکەوتی باشی نابێت.

فڕۆکەیەك لەبەرچاو بگرن، کە دەیەوێت لە شارێك بۆ شارێکی گەورەتر ڕێ بکەوێت. ئەگەر لەسەر هێڵی فڕین، تەنها یەك پلە لە ئاراستەکەی لا بدات، لەوانەیە لە ئەنجامدا، بگاتە شوێنێکی نادیار. ڕاستییەکە ئەوەیە کە زیاتر ٩٥٪ی فڕۆکەکان، لە یەك پلە، زیاتر لا دەدەن، بەڵام زۆرینەیان دەگەنە شوێنی مەبەست. بە واتایەك وێڕای تۆفان، گۆڕانی ئاراستەی باو شەپۆلو هەموو بەرزو نزمییەکان، کە لە مەودای ڕێگا دێتە سەر ڕێیان، دەتوانن لە شوێنی مەبەست بنیشنەوە.

بەم شێوەیەش، ئامانجی سەرەتایی، یەك سەرمایەگوزار، یان وەبەرهێنەر لە هۆشمەندیی بازرگانی ئەوەیە، کە لەگەڵ هەبوونی گشت تۆفانەکانی سەر ڕێی، یارمەتیی کۆمپانیاکەی بدات؛ بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاریکراو. ئەگەر وابێت بە تێگەیشتن لە چۆنێتیی سەرکەوتنی فڕۆکەوانەکان، بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا دەتوانن، بەهرەی باش لە سەرمایەگوزاریی هۆشمەندی بازرگانی بەدەست بهێنن.

**بەڵام فڕۆکەوان چۆن سەرکەوتوو دەبێت؟**

بە ڕەچاوکردنو جێبەجێکردنی ٦ خاڵی بگۆڕی قەیرانەکان، دەتوانیت ئەم سەرکەوتنە لە کارو کەسابەتدا وێنا بکەیت:

١- ڕوونو شەفافبوونی خاڵی دەسپێك.

٢- ئامانجی دیارو شوێنی مەبەست.

٣- هەبوونی پلانو بەرنامە.

٤- توانای گۆڕانکاری پێویست.

٥- توانای بەرپەرچدانەوەی خێرا.

٦- توانای بەرپەرچدانەوەی بەردەوام.

بەبێ ئەم تایبەتمەندییانە، هۆشمەندیی بازرگانی، تەنها چەند ڕاپۆرتو هێڵکاریی جوان دەبن، ئەگەرچی چەند گرنگییەکیان هەیە، بەڵام بەهاو نرخی ئەو سەرمایەگوزارییەی نابێت.

و. لە فارسییەوە: Harvard Business Review

# ڕۆڵی پەروەردەو فێرکردن، لە گەشەسەندنی ئابووریدا



بەشی سێیەم

ئا: سەلاح عیسا ـ خوێندکاری ماستەر لە تورکیا

لەو پێناسانەی بەشی پێشوو، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە پرۆسەی پەروەردە، یەکێکە لە پرۆسەکانی ژیانی تاك، کە لە دروووستکراوێکی سروشتییەوە، دەیکاتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، یاخود بەهۆی پرۆسەی پەروەردەوە، تاك دەتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرەکەیدا بگونجێنێت، لەبەرئەوە هەر کەسێك بۆئەوەی بمێنێتەوەو بتوانێت لە کۆمەڵگەکەیدا بژی، پێویستە بە پرۆسەی پەروەردەدا تێ بپەڕێت. یەکەم شوێنیش بۆ پەروەردەو فێربوون، بریتییە لە خێزان، یان باوەشی دایك؛ چونکە تاك زۆربەی بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانو ڕەفتارەکان لەوێوە وەردەگرێت، کە ئەمەش دەبێتە بناغەیەك، بۆ بنیاتنانی کەسێتیی ئەو تاکە. لەدوای خێزانیش قوتابخانە دێت کە ئەویش ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت بۆ فێرکردنو پەروەردەی تاك، پێویستە پەروەردەی قوتابخانەو خێزان هاوتەریبی یەکبنو دژایەتی یەك نەکەن، بۆئەوەی منداڵ کەسەرەتای پەروەردەیەتی تووشی سەرلێ شێواندنو دوو پەروەردەی جیاواز نەبێتەوە؛ چونکە لەو کاتەدا نازانێت کامەیان هەڵبژێرێت، بەڵکو دەبێت هەردووکیان تەواوکەری فێرکردنو پەروەردەی تاك بن.

پەروەردە.. هەردوو مانای پەروەردەکرنو کردنە مرۆڤێکی بەسوودی تاکەکان دەگرێتەوە؛ تا بتوانێت لە ناو ژینگەکەیدا بژیت، هەمیشە پرۆسەی فێربوونیش دەگرێتەوە؛ بۆئەوەی زانستە جۆراوجۆرەکان وەربگرێت، کە ئەمەی دووەمیان ئەرکی قوتابخانەیە، لەم پرۆسەیەدا منداڵ لە قوتابخانە زۆربەی زانستەکان دەخوێنێت، بەڵام خۆی لەکام جۆرەدا بینییەوە، پێویستە لەو لایەنەدا زیاتر پەرە بە تواناکانی خۆی بدات، بەڵام هەر بوارێك بێت، گرنگ ئەوەیە لە بوارەدا بتوانێت، خزمەت بە کۆمەڵگەکەی خۆی بکات. هەروەها هەندێ دەزگای تری پەروەردەییمان هەیە، کە ئەوانیش ڕۆڵی ناوەندی دەگێڕن بۆ پەروەردەو فێربوون، وەکوو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، یان توێژەندو گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لە هەر یەکێك لە بوارە جیاوازەکاندا، کە هەموو پێکەوە ئەرکی پەروەردەو فێرکردن بۆ تاك لە کۆمەڵگەدا فەراهەم دەکەن.

## پەیوەندیی نێوان پەروەردەو ئابووری

پەروەردەو ئابووری، پەیوەندییان زۆر بەهێزە، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە دەوڵەت هەلی یەکسان، لەبەردەم فێرکردنی تاکەکانی کۆمەڵگەدا فەراهەم دەکات، کە خۆی لە دابینکردنی هۆکارەکانی فێربوون، جیاوازینەکردن لە نێوان فێرکردنی کچانو کوڕان... هتد، دەبینێتەوە، ئیتر دەبینین لە بەرامبەردا ئاستی گەشەی ئابووری، چەند قات بەرز دەبێتەوە؛ چونکە هەتا ڕێژەی خوێندەوارو ئاستی ڕۆشنبیری، لە وڵاتدا بەرز بێتەوە، ئاستی بژێوی تاکیش گەشە دەکاتو بەپێچەوانەشەوە ڕاستە، بۆیە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی وڵاتە دواکەوتووەکان، بوونی ڕێژەیەکی زۆری تاکی نەخوێندەوارە.

هەر کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی پەروەردە، بۆسەر هەر لایەنێکی تری ژیان، لەدواییدا هەر بەدەستکەوتێکی ئابووری لێك دەدرێتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر پەروەردەی تەندرووست، تاکی هۆشیار لە ڕووی کلتوورییەوە بەرهەم بهێنێت، دەبینین ڕێژەی تاوان، لێرەدا کەم دەبێتەوە، کەواتە: لەبری دروووستکردنی زیندانی گەورە، دەرگای کۆنەکانیش دادەخرێن، بۆیە هەر پارەیەك کە بۆ نەهێشتنی تاوانو بنیاتنانی بینای بەندیخانە، پێشتر لەم پێناوەدا بەخەرج دەدرا، بۆ حکومەت دەگەڕێتەوە، هەروەها مرۆڤی خوێندەوار، چاکتر دەتوانێت خۆی لە نەخۆشیو هۆکارەکانی بپارێزێت، یاخود هۆشیاریی خواردنو تەندروستیو جۆرەکەی زیاتر دەزانێت، بۆیە جۆری نەخۆشیو ڕێژەکەی لەم کاتەدا بەرەو نەمان دەچێت، کە لە ئەنجامدا هەر خەرجییەك بۆ نەهێشتنی نەخۆشی تەرخان کراوە دەچێتەوە ناو خەزێنەی دەوڵەت، بۆیە ئەمە لە کرداری کشتوکاڵکردن دەچێت، هەر پارەیەك لە فێرکردندا خەرج بکرێت، لەدواییدا چەن قات بەرهەمی ماددیت پێ دەداتەوە، هەر لەبەر ئەمەیە دەبینین، وڵاتە پێشکەوتووەکان زۆرترینی بودجەکانیان بۆ فێرکردن تەرخان دەکەن.

زانایانی ئابووری، گرنگییان داوە بە پەیوەندی نێوان پەروەردەو ئابووریو کاریگەرییان لەسەر یەکتری، لە نموونەی ئەو زانایانەش (جۆن فیزی)، کە لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (ئابوورییەکانی پەروەردە)، کە تێیدا بیرو ڕاکانی ئینگلیزەکانی کورت کردۆتەوە لەبارەی گرنگیی پەروەردە لە گەشەپێدانی ئابووریدا، تێیدا هاتووە (پەروەردە پرۆسەیەکی ئابوورییانەیە؛ چونکە دەکۆشێت بۆ بەدەستهێنانی پیشەیەکی دیاریکراو، کە داهاتی ژیانی لەسەرە، هەرکات فێربوونو لێ هاتوویی‌و تواناکان زیاتر بوون؛ داهاتیش زیاتر دەبێت، لە هەمان کاتیشدا، ئەگەر تاکەکان پێکەوە لە شتە جۆراوجۆرەکاندا پێشکەوتن؛ داهاتیان زۆر دەبێت، پاشان داهاتی گشت کۆمەڵگەش زیاد دەبێت).

زۆربەی توێژینەوەکانی بواری ئابووری پەروەردەیی، ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە، کە پرۆسەی پەروەردە، بە وەبەرهێنان لە سەرمایەی مرۆیی دادەنرێت، وەکوو بەرجەستەکردنێك بۆی، ئەو پارەیەی کە بەخەرج دەدرێت لە بواری پرۆسەی پەروەردەدا، بە قازانج دەشکێتەوە بەسەر تاکەکاندا؛ چونکە بە کەمترین تێچوون، دەگەن بە باشترین شتێك، کە ویستوویانە. بۆیە هەر خەرجییەك کە بەئامانجی چاککردنی پرۆسەی پەروەردە بکرێت، ئەوە بە فیڕۆ ناچێتو لە داهاتوودا پێگەیاندنی تاکی بە سوودو خزمەتکارە بە بواری ئابووری.

ئەو سەردەمەی ئێستا، سەردەمی زانستو فێربوونە، ئەگەر جاران وڵاتان زۆربەی پارەکانیان، بۆ شەڕی یەکتری، لە کڕینی چەكو تەقەمەنیدا بەخەرج دەدات، بەڵام ئێستا جۆری شەڕەکە گۆڕاوە بۆ شەڕی زانست کە ئەمەش لەجیاتی کوشتنو خوێنڕشتن، گۆڕاوە بۆ ململانێی داهێنانە نوێیەکان، کبڕکێکان لە سەنگەرەکانەوە گواستراونەتەوە بۆ بازاڕەکانو شەڕی پێشکەوتنە عەقڵییەکان لە دروووستکردنی ئامێرەکاندا کە هەموویان دروووستکراوو بەرهەمی بیرە مەزنەکانن بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی، داگیرکارییەکان لە داگیرکردنی سەربازییەوە، گۆڕان بۆ داگیرکاری لە ئامێرە تەکنەلۆژییەکان، ئەمەش بەوە بەدی هاتووە، کە وڵاتان زیاتر گرنگی فێربوونو زانستییان بۆ دەرکەوت، بۆیە نەوەیەکی فێرکراوو پەروەردەکراو، وڵاتێکی پێشکەوتوو بەرهەم دەهێنێت.

# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازیی ڕایەڵەدا

## (نێتۆرك ماركێتینگ)

بەشی شەشەم

و: ئانا هەورامی




## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

## چەمکە پەیوەندیدارەکان بە نێتۆرکی مارکێتینگ

**جیاوازییەکانی نێوان داهاتی هێڵی و داهاتی تێکەڵ**

داهاتی هێڵی




هەتا کاتی زیاتر بەخەرج بدەیت، داهاتێکی زیاتر بەدەست دەهێنیت. لەبەرامبەریشدا ئەگەر کاتێکی کەمتر بەخەرج بدەیت، داهاتێکی کەمترت دەبێت. لە کۆتاییدا ئەگەر بەهۆی خانەنشینی، نەخۆشی، یان هەرشتێکی ترەوە، ئیتر توانای فرۆشتنی کاتی خۆتان نەمێنێت، ئەو کاتە ڕاستەوخۆ داهاتتان سفر دەبێتەوە.

داهاتی تێکەڵ

هەر بەو شێوەیەی کە لە نموونەکەدا دەیبینیت، لە NM ناچاریت کاتێکی زۆر تەرخان بکەیت بۆ ئەم بازرگانییە. لەم قۆناغەدا، داهات زۆر"کەم"ە. لەبەرئەم هۆکارە زۆربەی کەس، بەبێ درککردنی ئەم بابەتە، شێوازیNM واز لێ دەهێنن. هەتا لەم بازرگانییەدا بەرەو پێش بڕۆیت، کاتێکی کەمتر پێویستەو بڕی داهاتی بەدەستهاتوو لەکاتی پێویست زیاتر دەبێت.

داهاتی تێکەڵ




کاتێك کە کۆمەڵگەکەت بە ئەندازەی پێویست گەورە بوو، داهاتی زۆرروزەبەندە بەرەو تۆش وررووژم دەهێنێت. لەکۆتاییدا کاتێك کە لەم کارەدا خانەنشین بوویت، بەبێ ئەوەی کە هیچ کاتێك دابنێن، داهات هەر بەو شێوەیەی پێشوو بەردەوام دەبێت. درکی درووستی ئەم چەمکە لە نێتۆرکی مارکێتینگ، بەدڵنیاییەوە هەرکەسێك لەبارەی وزەی ئەم بازرگانییەوە سەرسام دەکات.

بەپێی ئەوەی NM کارێکی گرووپیو دەستەجەمعییە، ئەم چەمکە لە نرخێکی گەورە بەهرەدارە. ئەوەی کە ئەنجامی دەدەین، قابیلی زۆربوونە. ئەگەر هەرکەسێك لە کۆمەڵەکەی تۆدا، کەسەکانی خۆی بناسێنێت، کاریگەرییەکەی زۆر زیاد دەبێت. هەر بەو شێوەیەی کە ج. پاوڵ گیتی گوتوویەتی: "پێم باشە بە سوودوەرگرتن لە ١٪ هەوڵی ١٠٠ کەس داهات، بەدەست بهێنم، هەتا بە ١٠٠٪ی هەوڵی خۆم".

نهێنیی ئەم بابەتە، لە زیادبوونی کارە بچووکەکانی ئێوەدا پەنهانە، بەشێوەیەك کە هەر کەسێك هەمان کار ئەنجام بدات. بۆ نموونە لەبارەی ڕێبەری کۆمەڵەکە، کەسەکان زیاتر سەرنجی کارەکانی تۆ دەدەن، وەك لەوەی کە گوێ لە قسەکانتان بگرن! لەبەرئەوە ئەگەر دەتانەوێت ئەوان کارێك ئەنجام بدەن، خودی خۆشتان هەمان ئەو کارە ئەنجام بدەن.

ئەوەی کە لەم بەشەدا باس کرا، بەشێك لە گرنگترین چەمکەکانی نیتۆرکی مارکێتینگ بوون، لە کاتێکدا کە مەبەستی دەستپێکردنی ئەم کارەتان هەیە، درککردنیان بۆ تۆ زۆر پێویستە؛ تا کە بڕیارێکی باشتر بدەیت، وەڵامی ڕاستگۆیانەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە زۆر گرنگە:

١- ئایا خەونگەلی گەورەتان هەیە؟

٢- ئایا هیچ قەرزێکتان نییە؟

٣- ئایا لە خانوویەکدا کە ئارەزووت دەکرد، دەژیت؟

٤- ئایا ئەو ئۆتۆمبێلەی کە بەکاری دەهێنیت، ئۆتۆمبێلی خەونەکانتە؟

٥- ئایا بۆ خانەوادەو ئەزیزەکانت، ژیانی خەونەکانتان فەراهەم کردووە؟

٦- ئایا دڵەڕاوکێو نیگەرانییەکت نییە؟

٧- ئایا لەکاتی وەستاندنی کارەکەت هەر لەم ساتەدا، دیسانەوە هەر داهاتێکت دەبێتو دەتوانن بەردەوامی بەم شێوازە ژیانە بدەن؟

٨- ئەنجامەکانی وەستاندنی کار بۆ خانەوادەو ئەزیزانت چییە؟

ئەمانە چەند پرسیارێکی وردبینانەن، بەڵام یارمەتیت دەدەن کە بارودۆخی ڕاستەقینەت هەڵبسەنگێنیت. مەبەستی ئێمە ئەوە نییە، کە بەم پرسیارانە تێکت بشکێنین، بەڵکو بۆ یارمەتیدانتە؛ تا تێبگەن کە ڕێگایەك بۆ ڕزگاربوونت لەم بارودۆخە هەیەو ئەویش نێتۆرك مارکێتینگە. هەڵبەتە ئەگەر هیچ جۆرە دەمارگیرییەکت نەبێتو بەبێ هیچ جۆرە داوەرییەکی پێشەکی یارمەتی لێ وەربگریت. شتێك لەدەست نادەیت.لەوانەیە کەمێك لە کاتت لەم کارەدا بەخەرج بدەیت، بەڵام ئەزموونێك کە بەدەستی دەهێنیت، زۆر بەنرخترە لەو کاتەی بەفیڕۆی دەدەیت. هەربەو شێوەیەی کە ئەنتۆنی ڕۆبینز گوتویەتی: "مانای شێتی ئەوەیە کە مرۆڤێك هەر ساڵو هەر ساڵ، کارێکی نەگۆڕ ئەنجام بداتو چاوەڕوانی ئەنجامی جیاواز بێت."

ئەگەر ئارەزووی داهاتی باشترو جیاواز دەکەیت، پێویستە گۆڕانکاری بکەیتو لە ناوچەی هێمنیی خۆت، وەرە دەرەوە. ئایا بە ئەندازەی پێویست، "تینوو"ی گۆڕانکاریت؟ لەوانەیە NM بۆ تۆ گونجاو نەبێت، بەڵام هەتا ئەو کاتەی کە تاقی نەکەیتەوە، هیچ کات بە دروستی لەم بابەتە تێناگەیت.

NM بازرگانییەکی ئاسان نییەو پێویستی بە بەرپرسیارێتی هەڵگرتنو لە خۆبوردوویی هەیە. هەڵبەتە ئەو پاداشتەی کە لێیەوە وەردەگریت، نرخی هەموو ئەوانەی هەیە. پێویستە بەلایەنی کەمەوە، شەش مانگ، تا ساڵێك، ئەم بازرگانییە ئەزموون بکەیت؛ تا ئەنجامەکانی ببینیت. لە ڕابوردوودا هەتا ئەم کاتەی ئێستا، بەشێکی زۆری ژیانت، خەرجی بازرگانی، یان پیشەی ئێستات کردووە، باشیش دەزانیت، کە ئەنجامی چی بووە. ئێستا بۆچی بەشێکی کاتی خۆت تایبەت نەکەیت بەم بازرگانییەوە؟

لە درێژەی ئەم بابەتەدا، بە بنەماکانی پایەی NM دەگەیتو ئومێدەوارم کە لە کۆتاییدا بە زانیاریو هونەری پێویست بۆ سەرکەوتن لەم شێوازەدا_ کە بەخێرایی لەو هەلومەرجەی لە داگیرکردنی جیهاندایە_بگەیت.

دەستپێکردنی کار

## "کات بە فیڕۆ مەدە!"

### ناونووسین

دوای ئەوەی کە بڕیارتان دا، کە بە کام کۆمپانیای NM پەیوەندی بکەن، یەکەم هەنگاو ناونوسینە لە ژێر ناوی ئەو کەسەدا کە ئێوەی بەم کارە ناساندووە. ئەم کەسە ناسێنەری ئێوەبووەو بەرپرسە لەوەی کە یارمەتی ئێوە بداتو هەلومەرجەکانی سەرکەوتنی ئێوە لە NM فەراهەم بکات.

دڵنیابن لەوەی کە فۆڕمی داواکاریتان بە شێوەیەکی دروست پڕکردۆتەوە، بەتایبەت ناوی ئەو کەسەی کە دەتان ناسێنێتو باڵادەستەکەتان. چونکە هەر کە ڕەزامەندی کۆتایتان دەربڕی لە سەر نوسراوەکانی فۆڕمەکە، ئیتر ناتوانن گۆڕانکاری تێدا بکەن. لە زۆرینەی کۆمپانیاکانی NM مۆڵەتی ئەوەتان پێ دەدرێت کە هەم ناوی خۆتانو هەم ناوی هاوسەرەکەتان بە ناونیشانی داواکار جێگیر بکەن. هەندێك لە کۆمپانیاکان خاوەندارێتی هاوبەشی بەرێ پێدراو دەزانن. لە بیرتان نەچێت یەك کۆپی فۆڕم بە ناونیشانی سەنەد لە لای خۆتان بهێڵنەوە.

### باڵاسەرییەکان

پێویستە ئێوە بزانن باڵاسەرییەکانتان، تاچەند ئاستی سەروتر، چ کەسانێکن. دەتوانن ئەم زانیارییە لە ڕێگەی ناسێنەرەکەتانەوە، یان باڵاسەرییەکەی ئەوەوە بەدەست بهێنن.پێویستە بزانن پێشەنگەکانی باڵاسەرتان چ کەسانێکن تا لە کاتی پێویستیدا پەیوەندییان پێوە بکەنو لە ڕاوێژەکانیان سود وەربگرن. ناو، ناونیشان، ژمارە تەلەفۆنو e-mail ئەوانتان هەبێت.

### سیستمی چاودێری

پێویستە ئێوە لە دەستپێشخەرییە چاودێرییەکانی کۆمپانیا، وەکو خولی فێرکاریی، کارگەلی جیاواز، سیمینار، بابەتی فێرکاریو شتی تر بەهرەمەند ببن. زۆربەی کات کۆمپانیاکەت دوای تەواوبونی ناونوسی ئێوە، ئەم جۆرە بابەتو زانیارییانە دەخاتە ئیختیارتانەوە. باڵا دەستییەکانیشتان ئێوە دەخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە. چەندو چونی ئەم چاودێرییانە بە ناسێنەرەکەتان بڵێنو هەرچی خێراترە بەهرەی لێوەربگرن. ئەم جۆرە چاودێرییانە زۆربەی کات بریتین لەم بابەتانەی خوارەوە:

١- بەرنامەی کاتی کۆبونەوەکان.

٢- بەرنامەی کاتی وانە فێرکارییەکانو سیمینارەکان.

٣- بابەتی فێرکاری وەکو کتێب، کاسێتو CD و شتی تر.

٤- دەستپێشخەری هاندان (وەکو کەشتگەلی هاندان و...).

٥- ڕاوێـــــــــژ.




پەیام




# هەستەوەرەکان

جارێکیان کێشەیەکی گەورە کەوتە نێوان ئەندامانی هەر پێنج هەستەوەرەکانەوە، کە پێکهاتوون لە چاوو گوێو زمانو لووتو پێست!! هەر یەك لەوان دەیانەویست، خۆیان بە چاکتر لەوانی دیکە نیشان بدەن، پرسیارەکەی کە لایان درووست بوو ئەمە بوو: **کێ لە هەموان گرنگترە؟**

* سەرەتا چاو قسەی کردو گوتی: من گرنگترین ئەندامم لە جەستەی مرۆڤدا، مرۆڤ بە هۆی منەوە، هەموو شتەکانی دەوروبەری دەبینێت، ئەگەر شتێکی ترسناکی بینی، هەر بەهۆی منەوە دەیبینێتو لێی دوور دەکەوێتەوە..

* دواتر زمان هاتە گۆو گوتی: نەخێر، من گرنگترین ئەندامی جەستەم؛ چونکە ئەگەر من نەبم، مرۆڤ ناتوانێت بە ڕوونی ئەو شتە بڵێت، کە دەیەوێت!

* پاشان گوێچکە هاتە قسەو گوتی: نەخێر من هاوڕا نیم لەگەڵتاندا؛ چونکە من پێم وایە، کە گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ منم، نەك ئێوە، بەڵگەشم بۆ ئەم قسەیە، ئەوەیە کە مرۆڤ، ناتوانێت لە کەسانی دەوروبەری تێ بگاتو بەئاسانی وەڵامی قسەکانیان بداتەوە، ئەگەر من نەبم، بەبێ بوونی من، مرۆڤ ناتوانێت لە دەوروبەری تێ بگاتو بەئاسانی قسەیان لەگەڵدا بکات.

* لەولاوە لووت نەیتوانی لەوە زیاتر بێدەنگ بێت، لەبەرئەوە دەستی بە قسەکردن کردو گوتی: ئایا سوودەکانی منتان، بۆ ژیانی مرۆڤ لە یاد کردووە؟! ئەوە منم بۆنی خۆش هەڵدەمژمو دەروونی مرۆڤ ئاسوودەو خۆشحاڵ دەکەم، هەروەها بۆنی ناخۆشیش هەڵدەمژم؛ تا مرۆڤ خۆی لێ دوور بخاتەوە! ئەوە منم هەست بە بۆنە ترسناکەکان دەکەم؛ تا مرۆڤ بەپەلە بەدەمییەوە بڕواتو چارەسەری بکات.

* لە دوای هەموان پێست هاتە قسەکردنو گوتی: من گرنگترین ئەندامی جەستەم، ئەوە منم چواردەوری جەستەی مرۆڤم داوە، منم مرۆڤ لە هەموو شتێکی زیانبەخش، لە سەرماو گەرما، لە میکرۆبە زیانبەخشەکان، دەپارێزم، ئەوە منم خوێنو ئێسقانی مرۆڤم داپۆشیوە.

دوای ئەم مشتومڕە، چاو گوتی: هاوڕێیان با کەمێك بیر بکەینەوە، هەر یەك لە ئێمە، پێویستیمان بە یەکتر هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر من شتێك ببینم، ناتوانم باسی لێوە بکەم، بێگومان دەبێت زمانی هاوڕێم ئەو دیمەنەی من دیتومە لەبارەیەوە بدوێ!

کاتێکیش زمان دەیەوێت قسە بکات، ناتوانێت قسە بکاتو وەڵامی کەسی بەرامبەر بداتەوە، ئەگەر گوێی لە قسەی بەرامبەر نەبێت، بێگومان گوێچکە کرداری بیستنو تێگەیشتن لە بەرامبەر ئەنجام دەدات، پاشان زمان دەتوانێت قسە بکاتو وەڵام بداتەوە..

پاشان لووت، با خۆشترین بۆنی دونیا هەڵبمژێت، با ئەو بۆنانە هەڵبمژێت کە مرۆڤ حەیرانو سەرسام دەکەن، باشە دواتر چۆن دەتوانێت، باس لەو ساتە خۆشو بۆنە خۆشە بکات، ئەگەر زمان ئەو خۆشحاڵییە دەرنەبڕێتو باسی لێوە نەکات؟؟!!

خۆئەگەر پێست جەستەی مرۆڤ لەسەرماو گەرما نەپارێزێت؛ ئەوا هەموو جەستە بەجارێك نەخۆش دەکەوێت، ئەو کات هیچمان ناتوانین بە باشی کارەکانمان بەڕێوە ببەین، کەواتە: هەمووومان پێویستمان بە یەکترەو هەموان تەواوکەری یەکترین..

ئیدی هەموان پێکەوە سوپاسی (چاو)یان کردو دەستخۆشیو ئافەرینیان لێکرد، دواتر پێیان گوت: بەڕاستی تۆ داهێنانت لە ژیریو بیرکردنەوەماندا کردو هەمووانت بەئاگا هێنایەوەو وانەیەکی بەسوودت فێرکردین.

پاشان هەستەوەرەکان ڕێك کەوتن، کە پێکەوە هاوکاری یەکتر بنو پشتی یەکتر بگرن بۆ خزمەتی مرۆڤ، هەموان بەڵێنیان دا، کە هەرگیز جارێکی دیکە، ڕێگە نەدەن کێشەو دووبەرەکی بکەوێتە نێوانیانەوە؛ بۆئەوەی هەستەوەرەکانی مرۆڤ بەهۆی جیاوازیی نێوانیانەوە لەکار نەکەون!



# نەخۆشییە سێکسییەکان

## 2/2

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

### ب. نەخۆشییە گوازراوەکان لەڕێی سێکسەوە (Sexually transmitted diseases)

٥. ڤایرۆســی هێرپســی پەیوەنــد بە کۆئەندامــی زاووزێ (Genital Herpes): لە ئەنجامی ڤایرۆسێکەوە ڕوو دەدات، پێی دەگوترێت: (Herpes Virus)، دەگوازرێتەوە لەڕێی پەیوەندیی سێکســیو بەرکەوتن بە ئەندامە تووشبووەکان، یان لەڕێی دەمو لێــوەوە، کۆمەڵێك تلۆقی زۆر بە ئازار درووســت دەکات، لەســەر ئەندامی زاووزێی هەردوو ڕەگەز. نیشــانەکانی نەخۆشییەکە، بۆ دوو هەفتــە، یــان مانگێك بەردەوام دەبێت، پاشــان بۆ ماوەیەك دیار نامێنێــت، پاش دوو هەفتە، یان مانگێــك دەردەکەوێتەوە.. هێرشی ڤایرۆســەکە بۆ لەش، بۆ چەند ساڵێك بەردەوام دەبێت، بۆ ماوەیەکی زۆریش لەلەشدا دەمێنێتەوەو لەڕووی دەروونییەوە، کەســەکە وێران دەکات. ئەم دەردە ساڵانە ( ٥٠٠٠٠٠) کەس تووش دەکات لە ئەمریکا، ئێســتا زیاد لە ( ٣٠ ملیۆن)کەس لە ئەمریکا ئەم نەخۆشییەیان هەیە.

٦. هەوکردنی درێژخایەنی حەوزی ئافرەتان (Chronic Pelvic Inflammation):

هەوکردنێکی بەهێزە تووشــی کۆئەندامی زاووزێی ئافرەت دەبێــت، بەتایبــەت منداڵــدانو هێلکــەدان، چەنــد ئەندامێکی دیکــەی حەوزیش دەگرێتەوە، زیاتر لەڕێی ئەنجامدانی سێکســی ناشەرعییەوە ڕوو دەدات.

زۆرجاریــش بەهــۆی هاوســەرێکەوە تــووش دەبێــت، کە گیــرۆدەی ئەنجامدانی ســێکس بووە لەگەڵ کەســانێك جگە لە هاوســەرە پاکەکەی خۆی! ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، ئافرەتە تووشــبووە بەســتەزمانەکە زۆر بێگوناهانە ســەردانی پزیشکان دەکاتو نازانرێت هۆکاری ئەم ئازارو ناڕەحەتییانە چییە!!

بــەڵام لە ڕۆژئاوا، هۆکارەکە دیارەو ئافرەتەکە خۆی باجی هەڵەکانی خۆی دەدات، بۆ نموونە؛ تەنها لە ئەمریکا (٢،٥ ملیۆن) ئافرەت ســاڵانە ســەردانی پزیشــك دەکەن، بەهــۆی هەوکردنی درێژخایەنــی حــەوزەوە، هەروەهــا( ٢٠٠٠٠٠) ئافــرەت دەبرێنە ژووری فریاکەوتنــی خێــرا ( Emergency department) بەهەمان هۆکار، ســاڵانە زیانــی ئابووری لە ئەمریکا ( ٥ ملیار ) دۆلارە!

### ج. چارەسەر چییە؟

ڕاســتییەکی ڕوونو ئاشــکرایە، ئــەو وڵاتانــەی زۆرترین ڕێژەی نەخۆشــییە سێکسییەکانیان تێدایە، بریتین لەو وڵاتانەی ناســراون بە ئازادیی بێسنووری سێکسیو دوورن لە ڕێنماییەکانی پەروەردگار، هەرچەندە لە ڕووی زانستیشــەوە پێشــکەوتوو بن، بــۆ نموونە: ئەمریــکا، ئەوروپــا، هەندێك لەوڵاتانی باشــووری خۆرهەڵاتی ئاسیا، وەك: هیندو تایلەندو فلیپین.

لە کیشــوەری ئەفریقاشــدا وڵاتانی وەك؛ زائیــرو کینیاو ئەفریقای ناوەڕاســت، کە زۆربەیان گاورن، ئەم نەخۆشییانە زۆر بــڵاوە، بــەڵام وڵاتێکی وەك ســەنیگال کە زۆربەیان مســوڵمانن، ڕێژەی ئەم نەخۆشییانە زۆر کەمترن!

مامۆســتای مرۆڤایەتیی (ﷺ) دەفەرموێت: (هیچ گەلێك داوێنپیسیی تێدا بڵاوو ئاشکرا نابێت، تا ئەوەی دەردو نەخۆشیی وایــان تێدا بــڵاو دەبێتەوە، لــەوەو پێــش نەیانبینیبێت). رواه الحاكم وابن ماجه.

ئەو ڕێگایانەی ڕۆژئاوا بە چارەســەری دادەنێت، سوودێکی وای نییــە، وەك: بەکارهێنانــی کۆنــدۆم لەلایــەن پیاوەکــەوە، بەکارهێنانی دەرمانــی وەك دژەبەکتریا، یان کەمکردنەوەی ئەو کەســانەی سێکســیان لەگەڵ دەکرێت بۆ چەند کەسێك!.. بەڵکو چارەســەر، بریتییە لە خۆپاراســتنو پاکیزەیی، پەروەردگاریش دەفەرموێت: (......................) الأسراو ٢٣

چەندین جار وشــەی خۆپاراستنو پاکیزەیی ( الإحصان) لــە قورئاندا هاتووە وەك ( محصنين.... مســافحين) النســاء ٤٢، واتە: ئەو کەســانەی لەڕێی هاوسەرگیرییەوە، خۆیان پاراستووەو داوێنپیسیی ناکەن.

ڕێگاکانی خۆپاراستنیش بریتیین لە:

ئیمانو لەخوداترســان، لەڕێی ئەنجامدانی فەرمانەکانیو دوورکەوتنەوە لەو شتانەی حەرامی کردوون.

هاوســەرگیریو پێکەوەنانــی ماڵێکــی پــڕ لــە ســۆزو خۆشەویستی.

دوورکەوتنەوە لە تێکەڵاویو پاراستنی چاو.

پۆشتەیی ئافرەتانو باڵاپۆشی.

نەهێشــتنی ئەو کەناڵو بەرنامانەی داوێنپیســی، ئاســان دەکەنو بانگەشەی بۆ دەکەن.

جوانترین ئامۆژگاریش فەرموودەی پەروەردگارە (سورەتی نوور ئایەتی ٣٠)



# جاترە دژەزیندەییەکی کاریگەر!

جاترە، یەکێکە لە ناسراوترین گیا بەکارهاتووەکان لە بوارەکانی خواردنو تەندرووستیو جوانکاریدا، بە بۆنە خۆشو تامە بێوێنەکەیەوە لە گیاکانی تر جیا دەکرێتەوە، جاترە لە خێزانی نەعنایەو ٤٠٠ جۆری هەیە، میسرییە کۆنەکان زۆر بەکاریان هێناوە، یۆنانییەکانیش لە پەرستگاکانیاندا، لەبەر بۆنەخۆشەکەی، وەك بخور بەکاریان هێناوە، بەکارهێنانو بەسوودی جاترە، بۆ بوونی توخمەخۆراکییەکانو ڤیتامینو دژە زیندەییەکان دەگەڕێتەوە؛ لەبەرئەوەی ڤیتامینەکانی (A,B,C,K)و توخمەکانی وەك (پۆتاسیۆمو ئاسنو مەگنیسیۆمو کالیسیۆمو سیلینیۆم)و مادەی چالاکی وەك زەیتەکانی (سیمۆل، کارفاکۆل، سینیۆل، لینالۆل، بورنیۆل، جیرانیۆل) هەروەها ترشی فۆلیکو ترشی فینیك گلایکۆساید، هەریەکێك لەمانە گرنگیی تایبەتیی خۆی هەیە.

### سوودە تەندرووستییەکانی جاترە

**یەکەم:** جاترە یارمەتیی چارسەری ئەو نەخۆشییانە دەدات کە لە وەرزی زستان، یان بەهۆی سەرمابوونەوە سەرهەڵدەدەن، وەك: هەوکردنی سیکڵدانۆچکەکان، کۆکەڕەشە، ڕەبۆ، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، بەخواردنەوەی بێت، یان بەکارهێنانی زەیتەکەی بۆ چەورکردنی سنگی نەخۆش، پێش خەوتن.

**دووەم:** کار لەسەر بەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگری دەکاتو ماسولکەکان بەهێز دەکات بەتایبەتی ماسولکەکانی دڵو ڕێگە لە ڕەقبوونی خوێنبەرەکان دەگرێت، هەروەها ئازارشکێنەو خاوێنکەرەوەو چالاککەری سوڕی خوێنە، یادگەی بەهێز دەکاتو لەش خاوێن دەکاتەوە لە ماددەی زیانبەخش.

**سێیەم:** کۆئەندامی هەرس چالاك دەکاتو غازات لە گەدە دەکاتە دەرەوەو ڕێگە لە ترشبوونی دەگرێت، هەروەها یارمەتیی کرداری هەرس دەداتو ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ مژینی ماددەخۆراکییەکان لە ڕیخۆڵەدا.

**چوارەم:** جاترە چارسەری هەوی بۆرییەکانی میزەڵدانو نەخۆشییەکانی گورچیلەش دەکات، هەروەها سوڕی مانگانەی ئافرەتان ڕێك دەخات.

**پێنجەم:** لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا دەرکەوتووە جاترە توانای ڕێکخستنی تێکڕایی لێدانەکانی دڵو فشاری خوێنی هەیە، بۆیە دەتوانرێت لەجیاتی بەکارهێنانی خوێ لە خواردندا، جاترە بەکار بهێنرێت، هەروەها خواردنەوەی ئاوی جاترەی کوڵاو لەگەڵ هەنگوین بەسکی برسی، یارمەتیی خاوێنکردنەوەی خوێن دەدات.

**شەشەم:** یەکێکە لەو ڕووەکانەی کە بۆ ئازاری سکو دڵ تێکەڵ هاتنو ئازاری سەرو گوێو ئازاری ددانو کۆکەو کرمی ناو گەدەو هەوکردنی زمانو قوڕگ بەسوودە، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ مێخەك دا بەکاربهێنرێت، هەروەها بۆ ئەوانەی تووشی سکچوون بوون دەتوانن بەکاری بهێنن.

**حەوتەم:** یارمەتیی چالاککردنی پێستی سەرو ڕێگری لە وەرینی قژ دەکاتو بەهێزی دەکات.

**هەشتەم:** وەك پاککەرەوەیەك بەکار دێت دژی بەکتریاو کەڕوو و مێرووەکان، تەنانەت بۆ دەرکردن، یان نەهێشتنی مێشوولەش سوودی هەیە.

**نۆیەم:** لە درووستکردنی بەرهەمە بۆنخۆشەکانی وەك عەترو شامپۆو کرێم بەکار دەهێنرێت بەهۆی بۆنە تایبەتەکەیەوە.

خواردنی جاترە بەشێوەیەکی مامناوەندو بێزیادەڕەویکردن تێیدا، بۆ منداڵو ئافرەتی دووگیانیش هیچ زیان، یان کایگەری لاوەکی نییە، تەنها ئەو کەسانەی هەستیاریان پێی هەیە، یان ئەو کەسانەی نەشتەرگەری دەکرێن پێویستە نەیخۆن، بەهۆی ئەوەی ئەگەری خوێنبەربوون زیاد دەکات، هەروەها هاوشێوەی هۆڕمۆنی ئیسترۆجین کار دەکات لە لەشدا، بۆیە ئامۆژگاری ئەو کەسانەی شێرپەنجەی مەمکو هێلکەدانیان هەیە دەکرێت کە نەیخۆن.

سەرچاوە:


www.webteb.com
www.rjeem.com
www.dailymedicalinfo.com

بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

مۆمی ٤٤



# زانست نەک ژیری

و: ئاسیا سەلاح

زۆر جار خەڵکی مشتومڕ دەکەن، لەسەر باسی بەراوردکردنو پەسەندکردنی ژیریو زانست بەسەر یەکداو لە ڕادەی پێویستی هەریەکەیان بۆ داهێنانو پێشکەوتن، گەلێك لە ڕۆشنبیرەکانمان پێیان وابوو، لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژووماندا، کە پەسەندکردنی زانست بەسەر ئەقڵدا لە ڕۆشنبیری هێمن ناوەشێتەوە، لە یەکێك لەو مشتومڕانەی کە لەبارەی ئەم باسەوە هاتووە، لەسەر زمانی شاعیرێکە لە شیعرەکەیدا:

زانستی زاناو ئەقڵی ژیر، لەم دەورەدا مشتو مڕیان بوو
داخۆ کامیان پایەی شکۆمەندی بۆ خۆی دەست کەوتووە
زانست فەرمووی من دوامەبەستی ئەوم بەدی هێنا وەك دیارە
ئەقڵیش وتی بە من خوای میهرەبان خۆی بەیان کردووە
زانست ئاماژەی داو بە ئەقڵی فەرموو دووبارە بە ئاماژە
بەکاممان خوای میهرەبان لە قورئاندا خۆی نەخشاندووە
ئیدی ئەقڵ زانی زانست سەروەرێتیو بە مشتومڕ نابەزێ
سەری زانستی ماچ کردو وتی ماڵئاوا، پەندێکی باشم لێت وەرگرتووە

ڕۆڵەکانم، کەس ناتوانێت لەپایەی زیرەکیی کەم بکاتەوەو ڕۆڵی لە ڕێکخستنی زانستو ڕۆچوونی فەراموش بکات، لە پێناو گەیشتن بەشتێکی تازەدا، لێرەدا من نامەوێت سەرنجتان بۆ شتی بەڵگەنەویست ڕابکێشم، بەڵکو دەمەوێت بڵێم: زیرەکیو زانست هەردووکیان گرنگو سەرەکین بۆ داهێنانو سەرکەوتن، بەڵام هەتا زانست کەمتر بێت، ڕۆڵی زیرەکی زیاتر دەردەکەوێت، بەپێچەوانەشەوە، هەتا زانست زۆرتربێتو پێش بکەوێت، ڕۆڵی زیرەکی کەم دەبێتەوە، جا ئەو برە زانستەی ئەمڕۆ لەبەردەست دایە ئێجگار گەورەیەو هەر پانزە ساڵ جارێك، زانست چەند جارە دەبێتەوە، ئەمەش مانای وایە، بەهای زیرەکی بەرەو دواوە دەکشێتەوە، هەر لەم ڕوانگەیەوە ئەو بۆچوونە باوە لە ئارادایە کە دەڵێت: «زانست سەرچاوەی سەرەکی دارشتنی ئەقڵە».

یەکێك لەوانە: ئەقڵی بە بەرداش چواندووە، کە دانەوێڵە دەهاڕێت، زانستەکەشی بە گەنمەکە داناوە، جا چەند ئەو بەرداشە گەورە بێت، هەر ئەو ئاردە دەهێنێتە بەرهەم کە لە جۆری گەنمەکەیە، خۆ ئەگەر هیچی تێدا دانەنرێت؛ ئەوا ئەویش هیچی لێ بەرهەم نایەت.

زیرەکییەکی مامناوەند، لەگەڵ فێربوونێکی باشو بەردەوامو کۆڵنەدەرانە، هاوکات پلانێکی بەرزخواز، باشترە بۆ خاوەنەکەی لە زیرەکییەکی زۆر نایاب، بەڵام ڕێکخستنو زانستو بەرزخوازی لەگەڵدا نەبێت.

ئەمەش ئەو لێکدانەوە درووستەیە، کە پێی گەیشتووین، کاتێك ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لە بڕوانامەکانی داهێنان لە هەندێك وڵاتاندا تۆمار دەکرێت، لە هەندێکی تریشدا زۆر کەمن؛ چونکە ژیری لەسەر ئاستی نەتەوەو میللەتان هاوتان.

لە ڕاستیدا زیرەکی بەتەنها سوودی نییە، ئەگەر هیچی دیکەی لەگەڵدا نەبێت.

## ئایا ئەم تێگەیشتنە چی دەگەیەنێت بۆ ڕۆڵەکانم؟

بەپێی زیرەکیو تواناکانتان، بیر لە داهاتوو ئامانجەکانتان نەکەنەوە، بەڵکو هەوڵ بدەن، زانستی بەسوود بەدەست بهێنن، کە یارمەتییان دەدات بە ئامانجەکانتان بگەن.

گوێ بە قسەی خزمانو بەهەندێك لە مامۆستاکانتان مەدەن، کە پێتان دەڵێن: ئێوە زیرەك نین، یان زیرەکیتان مامناوەندە، هەمیشە ئەوپەڕی سوود لە کاتەکانتان وەربگرنو ئەو پسپۆڕییە بخوێنن کە بەلاتانەوە خۆشەو حەز بەخوێندنەوە دەکەن لەبارەیەوە.

کاتێك یەکێك لە ئێوە پێ دەگات، هەوڵ بدات لە هۆشمەندانی سەردەمەکەی زانست وەربگرێت، کاتێك مرۆڤ لە ئەو هۆشمەندانە زانست وەردەگرێت؛ ئەوا خۆی دەپاڵێوێت بۆئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان، ببێت بە نموونەیەك لە ئەوان، بەدوای زانکۆ نایابەکاندا بگەڕێن، با گرانیش بێت؛ چونکە فێربوونو ڕاهێنانی باش، دەبێتە جێگرەوەی ئەو کەموکوڕییانەی لە توانا ئەقڵییەکاندا هەیە.

بە ئارامگرتنو ورەبەرزیو سووربوون لەسەر وەرگرتنی زانست، هەر یەکێك لە ئێوە دەتوانێت لەماوەیەکی درێژخایەندا، ئەوە بەجێ بهێنێت کە ژیرەکان بۆیان بەدی نایەت، هەمیشە ئەو پێشبڕکێیەی نێوان کەروێشكو کیسەڵتان لە بیر بێت، کاتێك کەروێشکەکە بەهۆی لە خۆباییبوونو کەمتەرخەمییەوە دەدۆڕێتو کیسەڵەکەش بە کۆڵنەدانو بەردەوامی خۆی دەیباتەوە.

❖ چی درەوشـایەوە، زێڕ نییە، زۆربەی ئەوانەی دەخەنەوە مەرج نییە دڵخۆشـبن، زۆرجار ئەوەی بانگت دەکات شەرت نییە لە دڵییەوە بێت.

❖ زۆر کەس لە ژیاندا سەریان لێ دەشێوێت، بیروباوەڕەکانت لەسەر لەپی دەستت دابنێ، دەستکەوتەکانیش بخەناو دەستەکەی ترت، دەسـکەوت ئـاو وەزاری دەخات، تۆ خـاوەن بڕیاریت، باش بیرکـەرەوە، بەر لـەوەی بڕیار بدەیت، دڵنیا بە پێویسـتیت بە دنیایـەك سـەرکەوتنو بانگـەوازی ڕاسـتگۆیانەیە، ئاتاجـی بە هەزاران هەزار دڵنیاییو خۆڕاگری.

❖ هەموو خەڵك باشن، دڵسۆزو خانەدانن، تا ئەو کاتەی تاقی دەکرێنەوە، ئەوکات باشو خراپ، ڕاسـتگۆو داواکار، دەڵێم گشـت بنیادەم بە منو تۆیشـەوە، ئەمو ئەو، داوا بکەین لە پەروەردگار لە تاقیکردنەوەدا خۆڕاگر بین.

❖ پەژیـوان مەبە لە چاکەیەك کردووتـەو لەنێو خەڵکیدا دەنگی نەداوە، یان لەسـەر وتەیەکی ڕاست ئاریشەت بۆ درووست بـووە، خودا کـردەوەکان لەبیر ناکات، گەرچـی خەڵك لەبیریان بچێتـەوە، یاخود لەبیـر خۆیانی ببەنەوە، هەروەها پاداشـتیش لەبیر ناکرێت؛ لەبەرئـەوەی خەڵکی لەبیریان کردووە، دڵنیا بە گشت باشەکان لە «چەمەدان» سندووقی چاکەکاراندا لای خوڵای پارێزراون (خودا ناوی پـاك بەرزڕاگیراوە). دڵنیابەو چاکە بکە، قسەی پێ نەزانێك، گەوجێك، دڵتەنگت نەکات.

❖ خەڵکـی ڕەخنەت لـێ دەگرن، لەبەرئـەوەی ئەوەی لێت تێناگـەن، نـەك وەك تولەیەك لە خۆتو کەسـێتیت، دڵت لێوان لێو بکە لە لێبوردەییو ئارامی، ئاوی سـارد بکە بەسـەر ڕۆحتدا تا سـاردەوە بێتو گڕ نەگرێت، بۆ جاری دووەم، سـێیەمو دەیەم بیروڕاکانت ئاشکرابکە، خۆت لە کەسی تر بە گەورە مەزانە.

❖ لەوانەیە ژەمێك بخۆیتو زگت تێر بکات، بەڵام جەستەو مەژگت سـوودی لێ نەبینێت؛ چونکـە ئەو ژەمە خۆراکە بەهای ڕاسـتەقینەی خۆراکـی تێدا نییە، سـەرکەوتنی خێراو سـاناش وەهایـە، خاوەنەکەی کاژێرێك، یان زیاتر دڵشـادت دەکات، بەڵام نابێت بە خشتێکی چاك لە تۆمارکردنی دەستکەوتەکانی.

❖ دەوترێت ڕۆژگاری ئێمە، ڕۆژگاری ڕاگەیاندنو بازاڕسازییە، بەدڵنیاییەوە پێت دەڵێین: گەر لەو دووهونەرەدا شـارەزا نەبیت زۆر شـت لە دەسـت دەدەیت، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئەوە کارێکە، ڕووناکە وەك ڕۆژی نیوەڕۆ.

❖ پاراوترین زمان زوانی داهێنانە، هێندە باسی خۆت مەکە، لێگەڕێ کردەوە مەزنەکانت باست بکەن، ژیانو ناوبانگت بهێننو ببەن، تا جیهان گەورەییو ناوت ببینن، تەنها ئەوەندەت لەسەرە کاروکۆشش بکەیت، ماندوو بیتو ئارەق بڕێژیت، دواتر بەتەواوی بێدەنـگ بـە، واز بهێنە کردەوەکانت وتەبێـژی فەرمیت بن، لە سەدان وتاری بە بریقو باق پاراوترە.

❖ بیروباوەڕەکانت بە پێنووسـی جاف «ئەو پێنووسـانەی وشـك دەنووسـن» بنووسـە؛ تـا جێگیـرو ڕەگاوەژۆو دیاربـن، بیروبۆچوونەکانت بە قەڵەمی ڕەش بنووسە، تا بتوانیت، پێیاندا بچیتەوە، چاکردنو ڕاستکردنەوەیان تێدا بکەیت.

ڕێـزی «تەختەسـڕ»ی کەسـانی تـر بگـرە، بواریـان بدە ڕۆژێـك گەر ناڕاسـتیو پووچیی بۆچوونەکانت چەسـپا، ڕاکانت ڕەش بکەنـەوە، بزانە خراپترین شـت ئەوەیـە، پێچەوانەی ئەو هاوکێشـەیە هەڵسوکەوت بکەیت، لە نێوان شەوو ڕۆژێکدا ڕاکانت بنووسیتو ڕەشیان بکەیتەوە، ڕاوبۆچوونەکانت شاشو تەنك بن، یاخود هێندە ڕەقو دژواربن، نەتوانیت بیانگۆریت، یان ڕاسـتیان بکەیتەوە.

❖ لە ڕاسـتییەکانی ژیان، ڕاسـتییەکی تاڵ بۆ تەمبەڵەکان، مـرۆ ئـەوەی دەیەوێت، بەدەسـتی ناهێنێت، بەڵکـو ئەوەی پێ دەبڕێت، کە شایانێتی.

❖ هەندێك بە دەسـت پەپوولـە ڕاو دەکەن، لە بری ئەوەی بـە تیلەی چاو ڕاوی بکەن، وا دەزانن هێزو توندوتیژی، بەڵگەیە لەسەر جدییەت.

❖ زیاد لە پێویسـت خۆشەویسـتیت دەرمەبڕە؛ بۆئەوەی لە توانای خۆت زیاتر ئازار نەچێژیت، پێویسـتە هەموو شـتێك بە ئەندازەی ڕاستەقینەی خۆی بێت، تەنانەت ڕقو خۆشەویستیش، گشـت شـتێك لە جێگای گونجـاودا دابنێ، لـەوەش گرنگتر بە ئەندازەیەکی ورد.

❖ گشت بەڵاکانمان هەڵقوڵاوی نەزانینە، بە نەزانینی خۆمان لە گەورەی پەروەردگار یاخی دەبین، لە بێئاگاییمان بە یاساکانی خودا لە ژیاندا، تووشی ئاستەنگ دەبین، ئەوەی خۆشمان دەوێت لە دەسـتی دەدەیـن، ئێمەیان خـۆش دەوێت لە نەشـارەزاییان بە سرووشـتمان، یان سرووشـتیان» مەبەسـت سرووشتی ناخو کەسێتییە»... خودا نەزانین لەناوبەرێت.

# ئەو وانانەی لە قوتابخانەدا فێری نەبووین!

و: چیمەن لەتیف



# ئایا کەسێکی بوێریت؟

بۆ ئەوەی بزانیت کەسێکی بوێریت، یان بۆئەوەی نمرەی بوێری خۆت بزانیت، ئەوا بە دروستی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- ئایا هیچ کات بە مەبەستی هەڵگەڕان بە شاخدا، گەشتت کردووە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٢- ئایا کاتێك مەلە دەکەیت دەتوانیت لە ئاودا خۆت نوقم بکەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٣- ئایا حەز دەکەیت کافتریا، یان سوپەرمارکێتێك بکەیتەوە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٤- ئایا زیاد لە پێویستو توانای خۆت، خواردنەوە زیانبەخشەکان دەخۆیتەوە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٥- ئەگەر دوو کەست بینی دەمەقاڵێیانە، ئایا خۆت هەڵدەقورتێنی لە نێوانیانو وەکو ناوبژیوان ڕۆڵ دەبینیت؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٦- ئایا دەتوانیت مەلە بکەیت لە قووڵایی دەریادا؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٧- ئایا دەتوانیت لە تاریکایی شەودا، بە تەنیشتی گۆڕستاندا بڕۆیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٨- ئەگەر مار، یان ئاژەڵێکی دڕندەت بینی، ڕووبەڕووی دەبیتەوە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٩- ئایا دەتوانیت لە شەودا دەستی ئەو دزە بگریت، کە دەیەوێت دزی لە ماڵتان بکات؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٠- ئایا هەمیشە زیاتر لە خێرایی دیاریکراو شۆفێری دەکەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١١- ئایا حەز بە فیلمی ترسناك دەکەیتو دەتوانیت بە تەنها سەیری فیلمێکی ترسناك بکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا پێشتر کاری قاچاغیت کردووەو گومرگت نەدابێت؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٣- ئایا لە ڕێگەی خێرادا، ڕقت لە شۆفێریی تیژڕەوە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٤- ئایا لە کەناری چەمو دەریادا، جلوبەرگی مەلەوانی دەگۆڕیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٥- ئایا لەو باوەڕەدایت، ئامێرەکانی ناوماڵت چاكو دژەخراپ بوونن؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

دابەشکردنی خاڵەکان:

* لە خاڵەکانی (١-١٣) بۆ وەڵامی «بەڵێ» دوو خاڵو بۆ وەڵامی «نازانم» یەك خاڵو بۆ وەڵامی «نەخێر» سفر دابنێ.
* خاڵەکانی (١٤-١٥) بۆ وەڵامی «بەڵێ» سفرو بۆ وەڵامی «نازانم» یەك خاڵو بۆ وەڵامی «نەخێر» دوو خاڵ دابنێ.

ئەنجام:

- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ٢٦ -٣٠ خاڵدا بوو؛ تۆ کەسێکی زۆر ئازاو بوێریت.
- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ٢٢-٢٥ خاڵدا بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی ئازاو بوێریت.
- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ١٨-٢١ خاڵدا بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی تاڕادەیەك ئازاو بوێریت.
- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ١٣-١٧ خاڵدا بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی مامناوەندی.
- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ٩-١٢ خاڵدا بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی تا ڕادەیەك ترسنۆکی.
- ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ٥- ٨ خاڵدا بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی ترسنۆکیت.

ئەگەر کۆی خاڵەکانت، لە نێوان ٠-٤ خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی زۆرترسنۆکیت.



# من ئەستێرەکانم ژمارد!

سایە سەرگەتی

لەمنداڵییەوە وا بیر دەکەمەوە، کە دەتوانم هەموو شتێك بکەم، کاتێ پێیان گوتم: کەس ناتوانێت تەواوی ئەستێرەکانی ئاسمان بژمێرێت، هیچ باوەڕم نەکرد، چۆن دەبێت کارێکی هێندە ئاشکرا، سەخت بێت، بێگومان، ئەمشەو هەموو ئەستێرەکان دەژمێرم، دەستم پێکرد، یەك دوو ... تاژمارە دووسەد خەوم لێ نەکەوتبوو، بەیانی هەستام، بیرم کەوتەوە، کە من نەمتوانیوە ئەستێرەکان بژمێرم، ئەزموونی ئەم جۆرە شکستەم هەبوو؛ چونکە پێشتر کاتێك بیستم، مامۆستای زانست پێی وتین، ئاو ماددەیەکە ناتوانرێت بەدەست بگیرێت، دووبارە باوەڕم نەکرد، دەستم کرد بە تاقیکردنەوە، بەڵام هیچ کات نەمتوانی دڵۆپە ئاوەکان، لە دەستمدا بهێڵمەوە، ناچار بۆ ڕازیکردنی خۆم، پەرداخێکم پڕ لە ئاو کردو گرتم بەدەستمەوە، بەخۆمم گوت: ئافەرین، تۆ توانیت ئاوەکە بگریت بە دەستتەوە، خۆ ئەگەر من یارمەتیم نەدایە، پەرداخەکە نەیدەتوانی ئاوەکە بگرێت، لە ڕاستیدا ئەم جۆرە پەیوەندییە لەگەڵ ئاو بۆ من باشترە؛ چونکە هیچ پێویستم بە خاتوو ئاو نییە، کە لە دەستمدا بمێنێتەوە، بەڵام بۆ ئەستێرەکان، بابەتەکە جیاوازبوو، نەدەکرا، هەموو شەوێك شوێنەکانیان دەگۆڕا، ئەستێرەکانی سەرە ورچ، هەر شەوەو لە شوێنێك بوون، سێ ئەستێرە هاوڕێکە، هەرجارەو یەکێکیان، بریسکەی زیاتر بوو. ماندوبووم، وا بزانم بەڕاستی ئەم کارە ناکرێت، سەیری ئەستێرەکانم کرد، وەك ئەوەی لەبەردەم سوپای دوژمندا بم، زۆر تووڕە، سەرم بەخێرایی جووڵاندو وتم: نابێ، نابێت نەکرێت، ئۆو، سەیری ئاسمان بکە، کاتێ سەر دەسووڕێنی، شێوەی بازنەییە. کەواتە: بەش بەشی دەکەم، لەماڵی خۆمانەوە، تا مزگەوتەکە، لەوێوە بۆ ناوبازاڕ، تا ماڵی پوورم، بۆ ئەوسەری ئاسمان، کە کۆتایی شارە. ئەستێرەی ناو هەموو بەشەکانم ژمارد، زۆرم پێ نەچوو، لێم تێك نەچوو، من دوای هەوڵێکی زۆر، هەموو ئەستێرەکانم ژمارد. بەمنداڵی نەمدەزانی هۆکاری سەرکەوتنەکەم چییە؟ بەڵام بەردەوام هەر ئەو کارەم دەکرد، کارێکم دادەنا، بەش بەشم دەکردو، جێبەجێم دەکرد. لەسەر ئەو سیستەمە بەردەوام بووم، بەڵام دوایی زیاتر لە دوو دەیە ژیان، بۆم ڕوون بوویەوە، کە ئاسانتر دەتوانم ئەستێرەکان بژمێرم. ڕاستە دەبێت ئامانجو پلانت هەبێت، بێگومان دەبێت کارەکان، بەش بەش بکەیت، بەڵام دەبێت لە باشترین کاتو گونجاوترین هەلدا دەست پێ بکەیت. واتە: نابێت لە بەهاردا خەونی هەنار ببینیت، بۆ نموونە: ئێستە دەتوانم شەوێك ئەستێرەکان بژمێرم، کە چەند بەشێکی ئاسمان بە هەور داپۆشرابێت، ژماردنی ئەستێرەکان ئاسانتر، هەم لەوکاتەشدا ئاسمان جوانترە. بەڵام دۆزینەوەو درووستکردنی هەل، هیچ نهێنییەکی تێدا نییە، جگە لە پاڕانەوە لەو خودایەی کە هەموو شتێکی بە دەستە. ئەوەی لە دڵتدایە، داوای بکە، خودا هەموو شتێك دەتوانێت. لە فەرمودەیەکی قودسیدا خودای گەورە دەفەرموێت: (من لەجێی گومانی بەندەکەمم، من لەگەڵیدام، ئەگەر یادی کردم، ئەگەر لە لای خۆی یادی کردم، منیش لای خۆم یادی دەکەم، ئەگەر لە کۆمەڵێکدا یادی کردم، لە کۆمەڵێکی باشتر لەودا یادی دەکەم. ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە، باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر باڵێك لێم نزیك بێتەوە، هەنگاوێك لێی نزیك دەبمەوە. ئەگەر بەڕۆشتنی ئاسایی بێت بەرەو ڕووم، بەهەڵەداوان بەرەو ڕووی دەڕۆم)!

لە خودا نزیك ببەوە، تۆ کەسێکی زۆر گرنگیت، ڕاستە ئێمە، بەتەنیا ناتوانین هیچ کارێك بکەین، بۆیە دەبێت باوەڕ بەخۆت بێنیت، کە خودا گوێی لە دەنگی تۆیە، متمانەت پێی هەبێت، ئەو وەڵامت دەداتەوە، تێڕوانینی تۆ بۆ خودا، کارەکان جێبەجێ دەکات، گومانە باشەکان، سەربەرزت دەکات، متمانەبەخۆبوون، تۆ دەگەیەنێت بە لوتکە، کاتێك تۆ متمانەی گوڵێك بە خۆت ناکەیت، چۆن چاوەڕێیت، خودا بەهارت پێببەخشێت، لەگەڵ خودا بەرێز بە، لەناوەکانی تێ بگە، هێندە بە قەدەرەکانی ڕازی بە، تا عاشقی دەبیت، تا بوێریت، هەڵەکردنت نەبێت، ئەوجا خوداش، ئەو هەستەت پێدەبەخشێت، کە وابزانیت، ئەمڕۆ هەموو هەلەکان، هەموو ڕووداوەکان، بۆ پێشکەوتنی تۆ ڕوو دەدەن.



# ناتوندوتیژیی داهێنەرانە!

ئەسکەندەر ڕەحیم

ئاروّن گاندی، نەوەی مەهاتما گاندی، لەبارەی ژیانی باپیرییەوە دەڵێت: (ئەگەر ڕەگەزپەرستیو لایەنگری نەبوایە؛ گاندی سەری هەڵنەدەدا، ئەمەش بۆ خۆی، خودی بەربەرەکانێیو کێشمەکێشەکان بوو، گەر ئەو دوو هۆکارە نەبوایە" ڕەگەزپەرستیو لایەنگری"؛ ڕەنگە باپیرم یەکێکی دیکە بووایە، لە لیستی پارێزەرە سەرکەوتووەکانو سامانێکی زۆری بەدەست بهێنایە. وێڕای ئەوە، بەهۆی گرتنەبەری سیاسەتی جیاکاری لە باشووری ئەفریقیا، لە سەروبەندی گەیشتنی باپیرم بە ئەوێ، تووشی سووکایەتی پێکردن بوو، بەهۆی ڕەنگی پێستییەوە، لەو شەمەندەفەرەی گەیاندییە باشووری ئەفریقیا، بە زەبری زۆر کرایە دەرەوە، زۆر هەستی بەخۆشکانەوە کرد، تەنانەت یەك شەوی تەواو، لە شۆستەی وێستگەکە بەسەر برد، بیری دەکردەوەو لە خۆی دەپرسی: چیم لەدەست دێت، تا دادپەروەری بەدی بهێنم.

دوای ئەم ڕووداوە، تووڕەبوونو هەڵچوون، یەکەم کاردانەوە بوون، کە بەسەر باپیرمدا زاڵبوون، هێندە تووڕە بووبوو، حەزی بە تۆڵەو مامەڵە بە دەستەوام بوو، تا دادگەری بەدی بهێنێت، دەیویست بەتوندوتیژی، بەرپەرچی ئەوانە بداتەوە، کە سووکایەتییان پێ کرد، بەڵام گاندیی باپیرم بەسەر خۆیدا زەوتی خۆیی کردو گوتی: "ئەم شێوازە درووست نییە"

ئەم دادپەروەری بەدی نەدەهێنا، ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کورت، خۆشیی لەم شێوازە بهاتایەو پێی ڕازی بووایە، بەڵام نەك هیچ دادپەروەرییەکی بۆ بەدی نەدەهێنا، بگرە بازنەو مەودای ململانێکەی بەرفروانتر دەکرد.

ئیدی لەم ساتەوە، گاندیی باپیرم، پەرەی بە تێڕوانینو بیرۆکەی ناتوندوتیژی داو لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، هەروەها لە هەوڵو خەباتی بۆ بەدیهێنانی دادگەری لە باشووری ئەفریقیا پیادەی دەکرد. جا لەو دەوڵەتە، بیستو دوو ساڵی بەسەر برد، پاشان گەڕایەوە بۆ هیندستان؛ تا سەرکردایەتیی بزووتنەوەکەی خۆی، بە هەمان باوەڕو بنەما بکات. جا ئەو بزووتنەوەو جووڵانەوەیە، بوو بەهۆی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بۆ هیندستان، ئەو سەربەخۆییەیی هیچ کەسێك پێی وانەبوو، بەم بنەمایە بەدی بێت).

دیارە گاندی یەکێك لە پاڵەوانەکان. بەڵێ، ڕاستە گاندی کەسێکی بێکەموکووڕی نەبووەو هەموو ئامانجەکانی خۆی بەدی نەهێناوە، سەرباری ئەوەش لە ناخەوە، فێری هاوکاریی داهێنەرانە بووەو ڕێچارەی سێهەمی داهێناوە، ئەویش: ناتوندوتیژیی داهێنەرانەو زاڵبوون بەسەر بیرکردنەوە بە شێوازی دوو ڕێچارە (هەڵاتن، یان کوشتار)، ئەو نەیدەویست هەڵبێتو خۆی لە بارودۆخەکە بدزێتەوە، نەشیدەویست بکەوێتە ناو جەنگو کوشتارەوە، ئەم شێوازە (هەڵاتن، یان جەنگان)، ئاژەڵەکان لەو کاتەدا ئەنجامی دەدەن، کە گەمارۆ دەدرێن. ئیدی یان هەڵدێن، یان بەشەڕ دێن.

ئاشکرایە، گاندی ژیانی سێسەد ملیۆن مرۆڤ زیاتری گۆڕی، ئەویش بە بەکارهێنانی هاوکاریی داهێنەرانە.

ئەمڕۆکەش لە ملیارێك مرۆڤ زیاتر نیشتەجێن.. هیندستان پێگەیەکی ناوازەی هەیەو هەرکەسێك سەردانی هیندستان دەکات، هێزی ئابووریو وەرەی گەلێکی مەزنو سەربەخۆ بەدی دەکات، تەنانەت وای لێهاتووە، زۆرێك لە کۆمپانیا جیهانییەکان، هیندییەکان بوون بە سەرۆکیو جێگەو پێگە گرنگەکانیان بەڕێوە دەبەن!

سەرچاوە: البدیل الثالث

# نامەیەك بۆ نەوەكەم

زاهیر زانا سەیدگوڵ



ڕۆڵەی شیرینم، لە ڕۆژی هاتنە دنیاتەوە، بگرە پێش ئەوكاتەش، چەپكێك هیواو ئاواتم، بۆ ژیانو بوونت هەبووە، هەزارو یەك حەزو خۆزگەو خولیای جوانو چاكم، بە داهاتووتدا هەڵچنیووە.. ویستوومە، چرایەكی ڕۆشنو لوتكەیەكی بەرزی ڕەوشتو زانست بیت، بۆ خۆتو خێزانو گەڕەكو شارو نیشتمان، ببیتە مایەی سەربەرزیو بوونت مانایەكی تر ببەخشێت بە ژیانو شتێك زیاد بكەیت بۆ ئەم ژیانە، نەك ببیت بە بار بەسەر ژیانەوە، ئەمە ویستی هەر باوكێكە بۆ نەوەكەی، هەر وەك پەندی پێشینان دەڵێت: (پێی باشە هەر كەس بەتاقی تەنیا.. خۆی بەرزتر بێ لەخەڵكی دنیا.. بەڵام حەز دەكات جگەر گۆشەكەی.. لە ئەو بانتر بێ، ئەقڵو هۆشەكەی).

جگەرگۆشە ئازیزەكەم، دەمەوێت كۆمەڵێك چرپە بكەم بەگوێچكەتداو چەپكێك ئامۆژگاریت پێ بڵێم، كە ببێتە توێشوو بۆ كاروانی ژیانتو سوودی لێ وەربگریتو هەنگاوەكانت درووست بێتو ڕێگایەكی ڕێك بگریتە بەر؛ تا بگەیت بە مەنزڵی سەروەران. ئازیزەكەم، نامەوێت هەموو شتێكت، ڕێك وەك من بێت، بەڵكو هەمیشە باشترم بۆت دەوێتو دەخوازم لە هەڵەكانی منو كەسانی تر بەدوور بیتو خاڵە جوانەكانی هەر كەسێكیش وەربگریت، وەك چۆن هەنگێك شیلەی گوڵان دەمژێتو دەیكات بە هەنگوین. ئازیزەكەم، با گوفتارو ڕەفتارت بەرزبێتو بە ڕەوشتە باڵاكان، خۆت بڕازێنەرەوە، پابەندی وتەكانت بەو ڕاستگۆبەو با ڕاستگۆیی، ستراتیژی ژیانت بێت، ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشەو لێی ڕازیت؛ ئاواش لەگەڵ دەوروبەردا ڕەفتارو هەڵسوكەوت بكەو ئەوەشی بۆ خۆت پێت ناخۆشە؛ بۆ كەسانی تریش پێت ناخۆش بێت، هەمیشە نەرمونیانو لەسەرخۆ بەو بەخۆشەویستیو خاكیبوونەوە مامەڵە لەگەڵ كەسانی تردا بكەو ببە بەنەواو نساریانو هاوڕێیەكی نزیكو دڵسۆزبە، بەڵام ئاگادار بە هەموو نزیكێكیش، هاوڕێی دڵسۆز نییە.

جگەرگۆشەی شیرینم، ئەمڕۆ كاتی ئەوەیە بچێنیتو ماندوو ببیت؛ بۆئەوەی لە داهاتوودا بدووریتەوەو پشوو بدەیت، بیرت بێت، دەستی ماندوو، لەسەر سكی تێرەو بەچێژترین پشوودان لە شیوو دۆڵەكاندا نییە، بەڵكو كاتێكە بەماندوویی بگەیتە لوتكە بەرزەكان، بۆ دنیات كار بكە، وەك ئەوەی هەرگیز نامریتو بۆ دوارۆژیشت وا بژی، كە ئەمە دوا ساتی ژیانتە، بەخشندەو چاكەكار بەو لەو كەسانە ببوورە، كە هەڵەت بەرامبەر دەكەنو لەهەڵەو كەموكورتییەكانت سوود وەربگرە.

ئازیزم، هەموو ڕۆژێك وانەیەكی نوێیە بۆ ژیانتو لاپەڕەیەكی تازەیە، دەچێتە سەر دەفتەری ئەزموونەكانت، ئاگاداری بڕیارەكانت بەو زۆرباش بیر بكەرەوەو شەنو كەوی بكە، ئەوسا بڕیار بدەو هەردەم وەك زەریاكان مەنگو ئارام بەو لە پەرچەكردارو هەڵەشەیی بەدوور بە. ڕۆڵەی شیرینم، هەرگیزو هەرگیز، بێهیوا مەبەو هەمیشە لایەنە جوانەكانی ڕووداوەكان بخوێنەوەو گەشبین بەو لەمپەرو ئاستەنگەكانی ژیان تێ بپەڕێنەو لەناو دڵی شەوەزەنگاو بەئومێدی سپێدەیەكی زێڕین بە.

جگەرگۆشەكەم بە ئەمەكو پێزان بە، بە چاكە وەڵامی چاكەی دەوروبەرت بدەرەوە، سەری ڕێز دابنێ بۆ هەر كەسێك ڕێیەكی پیشان دایتو وشەیەكی فێر كردیت. ڕۆڵەی شیرینم، ڕێز لەبیرو بۆچوونی كەسانی تر بگرەو بیروڕای خۆت مەسەپێنە، بەڵكو بە بەڵگەی مەنتیقیو ژیرانەو بەهێمنی گفتوگۆ بكەو كەسانی ترو بیروڕاكانیان بە بچووكو كەم مەزانە.

خۆشەویستم، لەوەی زۆر ئامۆژگاریت بكەمو پرسیارت لێ بكەم دلگران مەبە، ڕۆژێك دێت زۆر باش تێ دەگەیت، نیگەرانییەكانم بۆچی بوون، لە كۆتاییدا ئامۆژگارییەكەی سەردارمانت بیر دەهێنمەوە، كە بە عەبدوڵڵای كوڕی عەباس دەفەرموێت: (سنوورەكانی خودا بپارێزە؛ دەتپارێزێت.. سنووری خودا بپارێزە؛ ڕێگاكەت دەدۆزیتەوە، ئەگەر داوات كرد؛ داوا لەخودا بكە، ئەگەر پشتت بەست؛ تەنها پشت بەخوا ببەستە.. بزانە، ئەگەر هەموو خەڵكی كۆ ببنەوە؛ تا سوودێكت پێ بگەیەنن؛ ناتوانن، مەگەر خودا بۆی نووسی بیت.. ئەگەر كۆببنەوە؛ تا بەحاڵ زیانت پێ بگەیەنن؛ ناتوانن، مەگەر خودا لەسەری نووسیبیت، پێنووسەكان بەرزكراونەتەوەو پەڕاوەكان وشك بوونەتەوە).

بەو هیوایەم سەركەوتوو سەرفراز بیتو مەشخەڵێكی داگیرساو بیتو ببیتە هۆكاری سوود بۆ گەلو نیشتیمانەكەت.

# وەڵامی بەجێ



لە پیاوێکیان پرسی: دایکت جوانترە، یان مانگ؟
ئەویش گوتی: کە دایکم دەبینم، مانگم بیر دەچێتەوە، کە مانگیش دەبینم، دایکمم بیر دەکەوێتەوە!

لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان پرسی: چەند دۆستی ڕاستەقینەت هەیە؟
لە وەڵامدا گوتی: ئێستا نازانم؛ چونکە ئێستا کاتی خۆشیو ئاشتییە، دۆستی ڕاستەقینە، لە تەنگانەو ناخۆشیدا دەردەکەوێت.

لە دانایەکیان پرسی: تەمەنت چەندە؟ گوتی: لەشم ساغە.
لێیان پرسییەوە: پارەت هەیە؟ گوتی: قەرزدار نیم.
لێیان پرسییەوە: دوژمنت هەیە؟ گوتی: دوور لە نزیکانم دەژیم.

ڕۆژی دوایــی لێت ناپرســن: چیت خوێنــدەوە، لێت دەپرسن: چیت کرد؟!

**تۆماس ئیه - سۆفی**

ئەگەر دەتەوێت ماســی زیاتــر بگریت؛ قولاپی زیاتر بەکار بهێنە!

**جۆرج ئەلین - ڕاهێنەری تۆپی پێ**

لەم جیهانــە ئاڵۆزەدا، هەر کات بتەوێــت، کات هەیە بۆ پێکەنینو قسەی خۆش، کەواتە: نیگەران مەبە.

**جێمس سیربەر - نووسەری کۆمیدی**

خەم مەخۆ، هەر شــتێک لەدەســت بدەی، لە شێوەیەکی دیدا، دەگەڕێتەوە بۆ لات.

**جەلالەدینی ڕۆمی - سۆفی**

گەر کەســێک بە خراپ باســی کردی؛ پارێزگاری لە خۆت مەکە، بەڵکو بڵێ: ئەم کەســە، من باش ناناســێت؛ چونکە من هەڵەی دیم زۆرن، کە دەتوانێت باسیان بکات.

**ئیبکتاتۆس - فەیلەسووف**

لەگەڵ هەمواندا نەرم بە، لەگەڵ خودی خۆتدا توند!

**نەنە تریزا**

# گۆرانی بلێ بۆ ژیان





# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## ٨ پاول ئالێن

## paul AllenJudit Polgár

نارین جووتیار

پاول گاردنەر ئالێن وەبەرهێنەرو بازرگانێکی ئەمریکییە، ناوبانگی دەرکردووە بە دامەزراندنی کۆمپانیای «مایکرۆسۆفت» لەگەڵ بیل گەیتس. لە ئاداری ٢٠١٣شدا لە ڕیزبەندی ٥٣ لیستی "فۆربس"ی دەوڵەمەندانی جیهانی بوو، سامانەکەی لە ساڵی ٢٠١٠ بە ٣١٫٥ ملیار دۆلار مەزندە دەکرا، ئاستی زیرەکی دەگاتە ١٧٠.

ئالێن لە ١٢ای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ لە سیاتل لە واشنتۆن لەدایك بووە، هەر لە منداڵییەوە، گرنگی بە زانستو زانیاری داوە، چووەتە قوتابخانەی تایبەتی «لیکساید»و هەر لەوێ لەگەڵ بیل گەیتس ئاشنا دەبێت، کە تەمەنی ١٤ ساڵ بووە، گەیتس ١٢ ساڵ، هەوڵیاندا تواناکانی خۆیان لە ڕووی بەرنامەسازی پەرە پێ بدەن لە تاقیگەکانی هەمان قوتابخانە «خەونی سەرەکیشیان ئەوە بوو، کە هەموو کەسێك ببێتە خاوەنی کۆمپیوتەرێکی تایبەت، پاشان ئالین لە کۆلێژی واشنتۆن وەردەگیرێت، بەڵام دوای دوو ساڵ زانکۆ جێ دەهێڵێت، تا لە کۆمپانیای «هۆنیوێل» لە بۆستن، وەك پڕۆگرامساز کار بکات، دەڵێن بیل گەیتسی هاوڕێی، ڕازی کردووە تا واز لە زانکۆی هارڤارد بهێنێت بۆ کارکردن لەسەر پڕۆژەیەکی گەورە، کە دەرەنجامەکەی دامەزراندنی مایکرۆسۆفت بوو لە ١٩٧٥ لە شاری «ئەلبوکیرەك»لە ویلایەتی نیومەکسیکۆ.

ئالین هەمیشە گرنگی بە بواری زانستو کۆمپیوتەرو فێرکاری داوەو دامەزرێنەرو سەرۆکی کۆمپانیای ڤۆلگان بووە، کە زۆربەی کارە بازرگانیو چالاکییە خێرخوازییەکانی لەخۆ دەگرێت، دواتر دەستی کرد بە کردنەوەی دەزگای تەندروستیو زانستی، لە ١٩٨٦ دەزگای پاول ئالین دادەمەزرێنێت، تایبەت بە بواری تەندروستیو مرۆیی بۆ گەشەپێدانی زانستو تەکنەلۆژیا، ساڵانە٣٠ ملیۆن دۆلار دەبەخشێت بۆ پڕۆژە مرۆییو زانستییەکان. کۆمەڵێك دامەزراوەی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیو پەیمانگای ئالین بۆ زیرەکی" و"دەزگای ستراتۆلانش سیستمز"ی دامەزراندووە، لە ٢٠٠٣ لەگەڵ جۆ ئالینی خوشکی "پەیمانگای ئالین بۆ زانستی مێشك" کردەوە، هەروەها چەندان پڕۆژەی جۆراوجۆری بەئەنجام گەیاندووە، هاوکات سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیای شارتەر"ـە، بۆپەیوەندییەکان ملیاران دۆلاری خستۆتە وەبەرهێنان لەڕێگەی کۆمپانیای خانووبەرەو ڕاگەیاندن، خاوەنی زیاتر لە ٤٠ کۆمپانیای تەکنیکیو سێ تیمی وەرزشییە.

**تووشبوون بە شێرپەنجە:** لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٩ جودی ئەلینی خوشکی، کە ئێستا سەرۆکی کۆمپانیای ڤۆلگانە، ڕای گەیاند کە پاول تووشی شێرپەنجەی لیمفەگرێ بووە، کە یەکێکە لە جۆرەکانی شێرپەنجە، بۆماوەی چەند مانگێك چارەسەری کیمیایی وەردەگرێت، ئەمەش هۆکار دەبێت بۆ دوورکەوتنەوەی لەکاری کۆمپانیای مایکرۆسۆفت، دەست لەکار دەکێشێتەوە بەڵام داوای لێ دەکرێت، وەك ڕاوێژکاری سەرەکی جێبەجێکردن بمێنێتەوە، لە ٢٠١١ یاداشتنامەیەکی بڵاوکردەوە، تێیدا باسی بیرۆکەی دامەزراندنی مایکرۆسۆفتی کردووە، چەندین خەڵاتی ڕێزلێنانی بەدەست هێناوە بەهۆی بەشداریکردنی لە ڕێکخراوە خێرخوازییەکان، یەکێکە لەو ملیاردێرانەی کە هەمیشە حەزی کردووە سامانەکەی خۆی لەگەڵ هەژاراندا بەش بکات.

زۆرن ئەوانەی بەرهەمی سەرکەوتنەکەیان دەبەخشن بۆ سەرخستنو بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگاکەیان، تۆش وەك تاکێك دەتوانیت، ڕۆڵ ببینی لە بەرەو پێشبردنی ژیانو بەدیهێنانی گۆڕانکارییەکان، کارو بڕیارەکانت هەرچەندە لای خەڵکی قەبووڵکراو نەبن؛ ئەوە مانای ئەوە نییە کە دەبێت وازی لێ بهێنیت، بەڵکو ئەوە بکە کە دەتەوێت؛ چونکە ئەگەر بۆ ئەوان مانایەکی نەبێت، بۆ تۆ زۆر مانا دەبەخشێت، ئالین دەڵێت: "ئەوەی زۆر دڵخۆشم دەکات، بیرۆکەی نوێو کارکردنە لەسەر پڕۆژەی داهێنەرانە"، کەواتە: گرنگە سەرنج بخەیتە سەر ئەو شتانەی، لە ژیاندا دڵخۆشت دەکەن، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە، جیهان بکەیت بە شوێنێکی باشتر بۆ ژیان" جیاواز بەو هەمیشە دۆزەرەوەو سەرکەش بە؛ لەبەرئەوەی بۆشایی ئاسمانو قووڵایی دەریاکان، بەشێکن لە سنووری ڕابوردوو.





## هەیاسی خاس

# کیسەیەك دینار

نموونەیەکی دیکە لە بیرتیژیو لێهاتوویی هەیاسی خاس لە دادوەریدا.. لە شاری واسیت، کابرایەك هەبوو بە ڕواڵەت زۆر بە چاك خۆی دەردەخست، خەڵکیش لەسەر ئەو ڕواڵەتباشییەی متمانەی زۆریان پێی بوو، ڕۆژێك کابرایەك دەیەوێت بڕوات بۆ گەشتێکی دوور، کە نەیدەزانی چەندی پێ دەچێتو کەی دەگەڕێتەوە، کورد گوتەنی: (سەفەر بەدەست خۆتە، بەڵام گەڕانەوە نا)، کیسەیەکی پڕ لە دیناری زێڕی هەبوو، کە هەزار دیناری تێدابوو، کابرا ناوبانگی ئەم پیاوخاسەی بیستبوو، لەبەرئەوە بەڕێ کەوت بۆ ماڵی کابرای پیاوخاس، تا کیسە پارەکەی، لای ئەم کابرا خاوەنمتمانەیە دابنێت، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە، کاکی ڕێبوار کیسەکەی بە شێوەیەك مۆر کردبوو، کە کردنەوەی ئاستەم بوو، خۆ ئەگەر هەرکەس کیسەکەی بکردایەتەوە، خاوەنەکەی دەیزانی کە کیسەکە کراوەتەوە.. کاکی ڕێبوار کیسە هەزار دینارەکەی، بەئەمانەت لای کابرا دانا؛ تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە، ماڵاوایی لێ کردو بەرەو گەشتەکەی کەوتە سەر ڕێ.

ڕێبوار گەشتەکەی درێژەی کێشاو نەگەڕایەوە، کابرای پیاوخاس، هەستی کرد کە ماوەکە زۆرەو ئەوە ساڵانێکە ئەو ئەمانەتەی لایەو خاوەنەکەی نەهاتۆتەوە، گومانی برد کە کاکی ڕێبوار، ڕەنگە ماڵاوایی لە ژیان کردبێت، خۆ ئەویش کەسێك لە میراتگرەکانی ناناسێت؛ تا ئەمانەتەکەیان پێ بداتەوە، هاوکات ئەگەری هاتنەوەشی لەبەرچاو گرتبوو، لەبەرئەوە کاتێك ویستی کیسەکە بکاتەوە، نەیتوانی بەشێوەیەك بیکاتەوە، هەستی پێ نەکرێت، لەبەرئەوە لە ژێرەوە کیسەکەی کون کردو دینارەکانی ناو کیسەکەی دەرهێناو لەبری دینارەکان درهەمی خستە ناو کیسەکەوەو وەکوو خۆی دوورییەوە؛ بۆئەوەی هەستی پێ نەکرێت..

ساڵانێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، خاوەنی کیسە دینارەکە گەڕایەوە بۆ شاری واسیتو ڕۆیشت بۆ لای ئەو کابرا پیاوخاسەی کە ئەمانەتەکەی لا دانابوو، دوای سڵاوکردنو هەواڵ پرسین، داوای ئەمانەتەکەی کردەوە، کابراش کیسە پارەکەی دایەوە دەستی، سەرەتا کابرا زۆر دڵخۆش بوو، کە ماڵەکەی وەکوو خۆی گەیشتۆتەوە دەستیو لەناو نەچووە، سوپاسی کابرای کردو گەڕایەوە ماڵ، بەڵام کاتێك کیسەکەی کردەوە، تووشی شۆك بوو، سەیر دەکات کیسەکە لەبری دینار، درهەمی تێدایە، وەك ئەوەی لە ئێستادا بڵێین، لەبری سەد دۆلاری تاك دۆلاری تێدایە!

هاوکات کیسەکەش هەڵنەپچڕاوە، کابراش زۆر بە پەشۆکاویو بە هەڵەداوان گەڕایەوە بۆ لای ئەو کابرا پیاوخاسەو گوتی: خودا لێت خۆش بێت، ماڵەکەم بۆ بگێڕەوە؛ من کیسەیەك دینارم لای تۆ دانابوو، تۆ کیسەیەك درهەمت بۆ من گێڕاوەتەوە..

کابراش کردی بە هەراو نکووڵی لێکردو گوتی: لەبری چاکەو پیاوەتی، ساڵانێکە ئەمانەتێکم بۆ پاراستوویت، ئێستا دەتەوێت پیاوخراپیشم بکەیت؟!

خاوەن کیسەکە، بەخەمباری ماڵی کابرای بەجێهێشتو لە ڕێچارەیەك دەگەڕا، دواجار بە بیری داهات، دەرمانی ئەم دەردە تەنها لای هەیاسی خاس دەست دەکەوێت، لەبەرئەوە ڕووی لە دادگاکەی هەیاسی خاس کردو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، هەیاسی خاس فەرمانی کرد، کە سکاڵالێکراو بانگهێشت بکەن بۆ دادگا، کاتێك هەر دووکیان (سکاڵاکارو سکاڵالێکراو) ئامادەبوون، هەیاسی خاس پرسیاری لە سکاڵاکار کردو گوتی: چەند ساڵە ئەو کیسە دینارەت لای ئەم پیاوە داناوە؟

سکاڵاکار گوتی: نزیکەی پانزە ساڵە، هەیاسی خاس بە سکاڵالێکراوی گوت: ئەوە ڕاستە کە پانزە ساڵە ئەو ئەمانەتەی لای تۆ داناوە؟

سکاڵالێکراو: بەڵێ جەنابی قازی، (پانزە ساڵە ئەمانەتێکم بۆ پاراستووە، هێشتا پیاوخراپمان دەکات!).

هەیاسی خاس هیچ پرسیارێکی دیکەی، نە لە سکاڵالێکراو نە لە سکاڵاکار نەکرد، فەرمانی کرد کە ئەو کیسەیەی بۆ بهێنن، کە درهەمەکانی تێدایە، کاتێك بەوردی لە درهەمەکان وردبوویەو بەرواری مێژووی دەرچوونی سکەی درهەمەکانی خوێندەوە، بینی هەموو درهەمەکان مێژووەکەیان، بۆ دوو تا سێ ساڵ لەوەوپێش دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوە ڕووی کردە سکاڵالێکراوو گوتی: ئەی ناپاك بڕۆ دینارەکان بۆ خاوەنەکەی بگێڕەوە، تۆ خۆت وتت پانزە ساڵە ئەم ئەمانەتەی لا داناوم، ئەم سکانە هی دوو ساڵ لەمەوبەرە!

پاشان فەرمانی دەرکردو گوتی: فڵانی کوڕی فڵان (سکاڵالێکراو) کەسێکی ناپاکە، تاوانەکەی لە دادگا سەلمێنراوە، هەموو لایەك ئاگادار دەکەینەوە کە لەمڕۆ بەدواوە، متمانەی پێ نەکەنو ماڵو سامانی خۆتان مەدەن بە دەستی، ئەو جۆرە کەسانە!

بەم شێوەیە هەیاسی خاس بەبێ ئازاردانو زیندانیکردن، تاوانبارانی دەستنیشان دەکردو بەشێوەیەك کە تاوانبار نەیدەتوانی نکووڵی لە تاوانەکەی بکات..

کابرای ناپاك، ناچار بۆئەوەی لەوە زیاتر ئابڕووی لە شاردا نەچێت، سەرجەم کەلوپەلەکانی فرۆشتو شاری واسیتی بەجێهێشت، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، هیچ کەس نە هەواڵی دەزانیو نە شوێنی.

هەیاس وانەیەکی فێری تاوانباران دەکرد، کە نەك هەر تاوانبار پەندی لێ وەردەگرت، بەڵکو هەزاران کەس، پەندیان لێوەردەگرتو لە تەڵەکەو فێڵو تاوان دوور دەکەوتنەوە.

## ئەو منداڵە بێباوکانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی!

بەشی سێیەم و کۆتایی

# پێغەمبەر موحەممەد ﷺ

بەرزان نەبوبەکر

## گەورەترین مرۆڤ لە مێژوودا ٥٧١ - ٦٣٢ زاینی

**سالی چوارەم:-** شەڕی جولەکەکانیان کرد؛ چونکە ئەو پەیمانەیان شکاند کە بە پێغەمبەر «ﷺ»و موسوڵمانانیان دابوو.

**سالی پێنجەم:-** شەڕی خەندەق ڕووی دا، لەم شەڕەدا بێباوەڕان سوپایەکی زەبەلاحیان هێنابووە سەر شاری مەدینە، دوای ئەوەی پێغەمبەر «ﷺ» هەواڵی زانی کە قورەیش بە سوپایەکی گەورەوە بە ڕێگاوەیە بەرەو شاری مەدینە، کەوتە پرسو ڕاوێژکردن لەگەڵ موسوڵمانان، دواجار ڕاوبۆچوونی سەلمانی فارسی پەسەند کرا کە بریتی بوو لە هەڵکەندنی خەندەقێك بەدەوری شاردا، سوپای موسوڵمانانیش لە ناوشاردا لە ئامادەباشیدا بن؛ بۆئەوەی ڕووبەڕووی هەر ئەگەرێك ببنەوە، کە دێتە پێش! موسوڵمانان بە سکی برسیو لەبەر گڕەو تینی گەرما، بەردەوام بوون لە هەڵکەندنی خەندەقێك بە دەوری شاری مەدینەدا، تا کاتێك سوپای قورەیش گەیشتنە مەدینەو خۆیان لەبەردەم خەندەقێکدا بینییەوە، کە ئاستەم بوو بتوانن پێیدا بپەڕنەوە، هەرچەندە ماوەیەك لەوبەری خەندەقەکە مانەوەو خێمەیان هەڵدا، بەڵام دواجار ناچاربوون بگەڕێنەوەو ناوچەکە بەجێ بهێڵن..

دواتر لە هەمان ساڵدا شەڕی بەنوقورەیزەیان کرد؛ چونکە لەو شەڕەدا بەڵێنیان بە قورەیش دابوو، هاوکارییان بکەن لە پەڕینەوە بۆ ناو شاری مەدینە.

**ساڵی شەشەم:-** پەیماننامەی حودەیبیە بەسترا، لە مانگی ذي القعدة، ساڵی شەشەمی کۆچی پەیماننامەی حودەیبیە لە نێوان موسوڵمانانو قورەیشدا واژۆ کرا، کە بریتی بوو لە ئاگربەستی نێوانیان بۆ ماوەی ١٠ ساڵ، بەم شێوەیە:

کاتێك پێغەمبەر «ﷺ» ڕایگەیاند کە دەیەوێت بڕواتە ناو شاری مەککە بۆ بەجێهێنانی عومرە، موسوڵمانان کە پێکهاتبوون لە ١٤٠٠ کەس لە پشتیوانانو کۆچەرییان، ئەوان هەموو بەرگی عومرەیان پۆشیبوو، بۆئەوەی نیازی خۆیان بۆ قورەیش دەربخەن کە بە مەبەستی عومرە هاتوون، نەك شەڕ، کاتێك لە مەککە نزیك بوونەوە، قورەیش ویستیان جەنگیان لەگەڵدا بکەنو ڕێگەیان نەدەن بڕۆنە شاری مەککەوەو عومرە بکەن..

پێغەمبەر «ﷺ»و موسوڵمانان لە حودەیبیە دابەزین، عوسمانی کوڕی عەفانی ناردە لای قورەیشو پێی گوت: بە قورەیش بڵێ: کە ئێمە نەهاتووین؛ تا جەنگتان لەگەڵدا بکەین، بەڵکو هاتووین؛ بۆئەوەی عومرە بکەین..

کاتێك عوسمانی کوڕی عەفان گەیشتە مەککەو پەیامەکەی بە قورەیش گەیاند، دواتر قورەیش عوسمانی کوڕی عەفانیان دەستبەسەر کرد، ئیدی عوسمانی کوڕی عەفان درەنگ کەوتو نەگەڕایەوە بۆ لای موسوڵمانان، لەنێو موسوڵمانانیشدا وا بڵاوبوویەوە، کە عوسمان کوژراوە.

لەبەرئەوە پێغەمبەر «ﷺ» داوای پەیمانی لە موسوڵمانەکان کرد، ئەوانیش هەموو پەیمانیان پێ دا، ئەم پەیمانەش ناونرا «بیعة الرضوان».

بەڵام قورەیش نوێنەرێکی بەناوی «عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی» نارد بۆ لای موسوڵمانان، کاتێك گەڕایەوە بۆلای قورەیش گوتی: ئەی گەلەکەم، من بە نوێنەرایەتی ڕۆیشتووم بۆ لای پاشاکانی فارسو ڕۆمو نەجاشی، سوێند بە خودا، هیچ پاشایەکم نەبینیوە ئەوەندە هاوەڵەکانی بە گەورەی دابنێنو خۆشیان بووێتو ڕێزی بگرن! کاتێك موحەممەد فەرمانێکی دەکرد پێشبڕکێیان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی، کاتێك قسەی دەکرد هەموان بێدەنگ دەبوون، هەموان بەوپەڕی ڕێزو شکۆمەندییەوە بۆی دەڕوانن، پاشان گوتی: من پلانێکتان بۆ دادەنێم قەبووڵی بکەن، قورەیش پلانەکەی عوروەیان پەسەند کرد..دواتر قورەیش بەخێرایی سوهەیلی کوڕی عەمریان نارد؛ بۆئەوەی ڕێککەوتن لەگەڵ موسوڵماناندا بکات، کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەر «ﷺ» لەسەر ئەم خاڵانە ڕێك کەوتن:

١- هەر تیرەو هۆزێك، لەگەڵ قورەیشدا پەیمان دەبەستێت ئازادە، هەرکەسیش لەگەڵ موسوڵماناندا پەیمان دەبەستێت ئازادە.

٢- بۆ ماوەی ١٠ ساڵ ئاگربەستیان ڕاگەیاند.

٣- دەبێت ئەم ساڵ موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو ساڵی ئاینده بێنەوە بۆ مەککەو عومرەکەیان بەجێ بهێنن.

٤- هیچ لایەنێک بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەر هیچ هۆزێك کە هاوپەیمانی قورەیشە، یان هاوپەیمانی موسوڵمانانە.

٥- هەر کەس لە قورەیش بەبێ پرسی خاوەنەکەی موسوڵمان بوو؛ دەبێت بیگێڕنەوە بۆ ناو قورەیش، بەڵام ئەگەر موسوڵمانێك پەشیمان بوویەوەو هاتە ناو قورەیش؛ ئەوا قورەیش نایگێڕێتەوە بۆ ناو موسوڵمانان.

هۆزی خوزاعە بوونە هاوپەیمانی موسوڵمانان، بەنوبەکریش بوونە هاوپەیمانی قورەیش.

**ساڵی حەوتەم:-** پێغەمبەر «ﷺ»و موسوڵمانان بۆ یەکەمجار دوای کۆچ، ڕۆیشتن بۆ شاری مەککەی پیرۆزو عومرەیان بەجێ هێنا، لە هەمان ساڵدا شەڕی خەیبەر ڕووی دا، موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر جولەکەکاندا، هەروەها لە هەمان ساڵدا پێغەمبەر «ﷺ» هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو صەفیەدا کرد.

**ساڵی هەشتەم:-** لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، موسوڵمانان بەبێ شەڕ، فەتحی مەککەیان کرد؛ چونکە قورەیش پەیماننامەکەی شکاندبوو، پەلاماری هۆزی خوزاعەیان دابوو، کە هاوپەیمانی موسوڵمانان بوون، ئیدی مەککە لە بتپەرستی پاك کرایەوەو گەڕایەوە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان، هەروەها لەم ساڵەدا، جەنگی موئتە ڕووی دا لە نێوان موسوڵمانەکانو ڕۆمەکاندا، هاوکات جەنگی حونەین لە دژی هۆزەکانی هەوازنو سەقیف ڕووی دا.

**ساڵی نۆیەم:-**

غەزای تەبووك ڕووی دا، کە کۆتا جەنگ بوو کە پێغەمبەر «ﷺ» بەشداریی تێدا کرد، هەر لەو ساڵەدا وەفدو نوێنەری هۆزەکانی دوورگەی عەرەبی، دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر «ﷺ»و پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئیسلامەوە، ئەو ساڵە ناونرا ساڵی وەفدەکان.

**ساڵی دەیەم:-**

لەم ساڵەدا پێغەمبەر «ﷺ» حەجی ماڵاوایی کرد، بە بەشداری زیاتر لە سەد هەزار لە هاوەڵانی..

**ساڵی یانزەیەم:-**

لەم ساڵەدا پێغەمبەر «ﷺ» لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کرد، کە کۆی تەمەنی ٤٠ ساڵی پێش پێغەمبەرایەتیو بیستو سێ ساڵیش پێغەمبەر بوو، لەو بیستو سێ ساڵەش ١٣ ساڵ لە مەککە بوو، ١٠ ساڵیش لە مەدینە بوو.

بەم شێوەیە پێغەمبەر «ﷺ» تەنها لە ماوەی بیستو سێ ساڵی پێغەمبەرایەتیدا، توانی بە جوانترین شێوە پەیامی خودایی بگەیەنێتو خەڵکی لە بتپەرستیو نەزانینو نەفامی ڕزگار بکات، لەو ماوە کورتەدا توانی دەوڵەتی ئیسلامی درووست بکاتو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بانگ بکات بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلامو گەورەترین شوێنەوار لە دڵی شوێنکەوتوانیدا درووست بکات..

ئەو ئایینەی بە تەنها خۆی دەستی کرد بە بانگەواز بۆی، دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە ١٤ سەدەو لە ئێستادا شوێنکەوتوانی بە زیاتر لە یەك ملیارو نیو مەزەندە دەکرێن!

**وتەی زانایانو ناوداران، سەبارەت بە پێغەمبەر موحەممەد «ﷺ»:**

**بوسورث سمیث:**

لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (محمد والمحمدية)دا دەڵێت: موحەممەد نە سوپایەکی ئامادەکراوو تایبەت بە خۆی هەبوو، نە چاودێرێکی تایبەت، نە کۆشکێکی ڕازاوەو بڵندو نە مووچەیەکی تایبەت، ئەگەر بگونجێت کە بگوترێت کەسێك حوکمو فەرمانڕەوایی بە قەدەری خودا کردووە، ئەوە موحەممەدە؛ چونکە توانی کە دەسەڵات بگرێتە دەست، بێئەوەی هۆکارەکانی لە بەردەستدا بێت، یان کەسوکاری یارمەتی بدەنو لەگەڵیدا بن.

**بەرناردشۆ:**

لە بیرکردنەوەدا، جیهان پێویستییەکی ئێجگار زۆری بە کەسێکی وەك موحەممەد هەیە، ئەم پێغەمبەرە کە ئایینەکەی بەردەوام جێگەی ڕێزو گەورەیی بووە، بە ڕاستی بەهێزترین ئایینە کە دەتوانێت هەموو شارستانیەتێك لە خۆیدا جێ بکاتەوە، هەتا هەتایە بە نەمری بمێنێتەوە، من زۆرێك لە نەتەوەو هاوزمانەکانم دەبینم، کە چوونەتە سەر ئەم ئایینە، بەپێی بەڵگەو ڕۆشنایی، ئەم ئایینە لە داهاتوودا، گۆڕەپانێکی فراوانی بۆ درووست دەبێت لەم کیشوەرەدا (کیشوەری ئەوروپا).

**سانت هیلەر**

زاناو ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی سانت هیلەر دەڵێت: موحەممەد سەرۆکی وڵات بوو، هەروەها شەونخوونی دەکرد لە پێناو ژیانو ئازادی گەلەکەی، تۆڵەی لەو کەسانە دەسەندەوە کە خراپەیان ئەنجام دەداو لە ڕێ دەردەچوون لە کۆمەڵگایەکدا کە پڕ بوو لە کەسو کۆمەڵانێك کە دڕندە بوون، پێغەمبەر بانگی دەکردن بۆ یەکخواپەرستیو وازهێنان لە زوڵمو ستەم، بەڕاستی لەسەرخۆو نەرمونیان بوو لە بانگەوازەکەیدا، تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکانیشیدا، لە کەسێتیی ئەودا دوو سیفەتی سەرەکی بەدی دەکرا، کە لە جوانترینو باشترین سیفەتو ڕەوشت بوون، مرۆڤایەتی هەڵی گرتبن، ئەوانیش: دادپەروەریو بەزەیی..

**تۆماس کارل..**

دەڵێت: موحەممەد تیشکو تروسکاییەك بووە هەموو جیهانی ڕووناك کردۆتەوە، ئەمەش فەزڵی خودایە کە دەیدات بە هەر کەسێك کە بیەوێت. هەروەها دەڵێت: ژیانی پێغەمبەری ئیسلامم زۆر بەچاکی خوێندۆتەوە، هیچ شتێکم لێ نەبینیوە تەنها ئاکارو ڕەوشتی جوان نەبێت، کە هەر دەبێ لەودا مسۆگەر بکرێت، ئاواتەخوازبووم کەوا ئیسلام تاکەڕێگەیەك بوایە بۆ جیهان.

**وڵ دیورانت..**

نووسەری ئەمریکی وڵ دیورانت خاوەنی "شافەرهەنگی شارستانی "قصة الحضارة"، کە (٣٠)بەرگە، دەڵێت: ئەگەر بڕیارمان لەبارەی گەورەیی کەسێکی گەورەو کاریگەریی لەسەر خەڵك دەکرد؛ ئەوا دەڵێین: موحەممەد گەورەترین گەورەترینەکانی مێژووە؛ چونکە توانی ئاستی ڕۆحیو ڕەوشتی گەلێك بەرز بکاتەوە، کە وشکیی بیابانو گەرمیی هەوا خستبوویە تاریکییەکی کێوی ئاسا، لە بەدیهێنانی ئەم مەبەستە، سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا، کە هیچ چاکخوازێکی تر لە مێژوودا، نەیتوانی بەدەستی بهێنێت!

جەلال عەبدوڵا حاجی




# نەوت‌و (ژینگە،کۆمەڵگەو مافی مرۆڤ)

بێگومان قۆناغی نەوت، ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو، لە پێشکەوتنی پیشەسازی‌و شێوازی ژیانی سەردەمییانە، باجی ئەم پێشکەوتنە، زۆر لەوە گەورەتر بوو کە پێشبینی دەکرا؛ تا دێت گرنگیدان بەلێکۆڵینەوە لە لایەنە خراپەکانی نەوت زیاتر دەبێت، لەڕووی کاری دەرهێنان، گواستنەوەو بەکاربردنی، تا چەند کاریگەری هەیە لەسەر ژینگە، تەندرووستی، ژیانی مرۆڤ‌و مافەکانی مرۆڤ؟

پیسبوونی ژینگە بەهۆی لێچوون‌و بڵاوبوونەوەی نەوتەوە بەردەوامە، لە ئەنجامی تێکشکانی کەشتی‌و بۆری‌و تانکەرەکانەوە، دەبێتە هۆی پیسبوونی کەناراوی دەریاکان، ڕووبارەکان‌و تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەیی ئاوی، ئەو گۆڕانەی لە کەشوهەوای زەویدا ڕووی داوە، لەسەر ئاستی جیهانی، کارەساتێکی گەورەی ژینگەیی‌و تەندرووستی گشتییە، هەرچەندە بەرهەمهێنەرانی نەوت گومانیان هەیە لەوەی، نەوت هۆکاری بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی گۆی زەوی بێت.

دەرهێنانی نەوت، پێویستی بە هەڵکۆڵینی زۆرە؛ بۆئەوەی بگەیتە قووڵاییەکی زۆر لەژێر ڕووی زەویدا، بەزۆری کاری هەڵکۆڵین لەو ناوچانەدا دەکرێت، کە ژینگەکەیان هەستیارو دوورەدەستە، نەوت‌و ئەو ماددانەشی کە لەگەڵیدان ماددەی کیمیایی زۆر ژەهراوین، کرداری بەرهەمهێنان‌و گواستنەوە بۆ مەودایەکی دوور، لەڕووی تەکنیکییەوە کارێکی زۆرقورسە، لە ڕووی ژینگەییشەوە مەترسیدارە. ئەگەر بەبەردەوامی لێچوون‌و بڵاوبوونەوەی نەوت ڕوو بدات، زیان بەڕووەک‌و گیانلەبەران دەگەیەنێت. لە هەریەکێک لە قۆناغەکانی بەرهەمهێنانی نەوتدا ئەگەری ڕوودانی کارەسات هەیە.

ڕەنگە دەرهێنانی نەوت، کاریگەریی کۆمەڵایەتیشی هەبێت، شوێنی گەڕان‌و هەڵکۆڵینی نەوت لەلایەن کۆمەڵێك سەربازی زۆرەوە چاودێری دەکرێت، هەندێك حاڵەت ڕووی داوە، کۆمپانیاکانی نەوت لەگەڵ سوپا، یان هێزەکانی پۆلیسدا بەشداربوون لە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤدا بەشێوەیەکی ترسناك.

کاتێك پرۆژە نەوتییەکان دەست بەکار دەکەن، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەشێوەی ڕاستەوخۆ، هیچ ڕاپرسییەك بە زیانلێکەوتوان ناکرێت، یان بەجۆرێك پرسیان پێدەکەن، کە هیچ کاریگەرییەکیان نابێت، لەکاتی بڕیارەکانی پرۆژەکەدا، کاتێکیش هاوڵاتیان نارەزایی دەردەبڕن بەرامبەر کاریگەرییە خراپەکانی پرۆژەکە، دەسەڵاتداران بە کشتوبڕکردن‌و کردەوەی شەڕەنگێزانەو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ.

شوێنی هەڵکۆڵینی نەوت، دەورێکی کاریگەری هەیە، لە گۆڕینی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەو شوێنەدا، ئەو کەسەی کاری دەست بکەوێت، شوێنی خۆی دەگرێت، باڵادەست دەبێت لەبەرامبەر ئەوانەی کاریان دەست ناکەوێت، هەروەها دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت، کارێکە بەشی هەرەزۆری، پشت بە تەکنەلۆژیا دەبەستێت، ئەوکەسانەی لێهاتوو نین، هەلی کاریان دەست ناکەوێت.

کاتێك نەوت دەست دەکات بە هەڵقوڵین، نرخی شتومەك‌و خزمەتگوزارییە نێوخۆییەکان بەرز دەبنەوە، ئەوانەی لەکۆمپانیا کاریان دەست دەکەوێت، واز لە ئیشە کۆنەکەی خۆیان دەهێنن، هەروەها شێوازی ژیانیان دەگۆڕێت، دابونەریتی کۆمەڵگە گۆڕانی بەسەردا دێت؛ لەبەرئەوەی کرێکارەکان لە خێزانەکانیان دوورن، لەکەمپەکاندا پەنا بۆ کاری لابەلا دەبەن، نەخۆشی ئایدز بڵاو دەبێتەوە.

بۆیە دەبێت لێکۆڵینەوە لە دەرئەنجامەکان بکرێت، لەگەڵ دەستنیشانکردنی خاڵە خراپەکاندا. نەوت دەبێتە هۆی پێشکەوتن، بەڵام دەبێتە هۆی هەژارکردنی کۆمەڵگا، بۆیە دەبێت ڕەخنەو شیکردنەوە بکرێت لەوەی حکومەت‌و کۆمپانیاکان دەیکەن، بۆچارەسەرکردنی ئەم کاریگەرییانە بەئامانجی سووککردنیان.

لەڕووی داراییەوە، نەوت داهاتێکی بەسوودە بۆ کۆمەڵگەی خۆجێی، ئەگەر بەشەفافی‌و دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، دەتوانرێت‌و دەبێت ئەوئەنجامە بەسوودانەی کە لە نەوت چاوەڕوان دەکرێت، لەچوارچێوەی سوودی کۆمەڵایەتی‌و ژینگەیی ئەم کۆمەڵانە سەیر بکرێت.

سەرچاوە: کتێبی (الرقابة على النفط – دليل الصحفي في مجال الطاقة والتنمية- التخلص من لعنة الموارد)- ريفينيو وتش- معهد المجتمع المنفتح.



# پاولۆ کۆیلۆ - Paulo Coelho ١٩٤٧ - ٠٠٠٠

شاعیرو ڕۆماننووسی بەڕازیلی، کە یەکێکە لەو نووسەرانەی بەگشتی وتارو کتێبەکانی، لە جیهاندا پڕخوێنەرترینن، کۆیلۆ لە ٢٤ی ئابی ساڵی ١٩٤٧ لە خێزانێکی مامناوەندی لە ڕیودیو جانیرو لە بەڕازیل لە باوکێکی ئەندازیارو دایکێك کە خانمی ماڵ بووە هاتۆتە دونیاوە.

ئەم منداڵە هەروەك منداڵانی ئاسایی، سەرەتا چووەتە قوتابخانەو لە قوتابخانەی (جیزوت) لە ڕیو دەستی بە خوێندن کردووە، پاولۆ کۆیلۆ بەشداری سەرجەم پێشبڕکێ ئەدەبیو شیعرییەکانی قوتابخانەکەی کردووەو هەمیشە خەڵاتی جوانترینو براوەی یەکەمی وەرگرتووە، بەڵام ئەو خەڵاتو بەشداریکردنە هیوابەرزەکانی پاولۆ کۆیلۆی تێراو نەکردووە، هەر لەبەرئەوە هەمیشە لە کارەکانیو ئاستی خۆی ڕازی نەبووە، هەندێجاریش نووسینەکانی خۆی دڕاندووەو خستویەتییە سەلەی خۆڵەوە، ئەم پەسەندنەکردنەی بەرهەمەکانی لەلایەن خۆیەوە بووەو ڕای خۆی بووە، ئەگەرنا لە بنەڕەتدا نووسینەکانی بەهێزو بەپێزبوون، تەنانەت جارێکیان خوشکەکەی یەکێك لەو بەرهەمانەی کە پاولۆ کۆیلۆ فڕێی دابووە نێو زبڵدانەوە، لەبەرئەوەی لە ئاستەکەی ڕازی نەبوو، خوشکەکەی هەڵی دەگرێتەوەو لە قوتابخانە بەناوی خۆیەوە پێشکەشی دەکات، لە ئەنجامدا خەڵاتێکی گەورە بەدەست دەهێنێت.

هەر لەو کاتەوە ئەم منداڵە، پیشە ڕاستەقینەکەی خۆی دەدۆزێتەوە، لەبەرئەوە دەیەوێت ببێتە نووسەرێکی بەئەزموونو لێهاتوو، بەڵام دایكو باوکی بۆچوونێکی دیکەیان دەبێت، ئەوان دەیانەوێت کوڕەکەیان (پاولۆ کۆیلۆ) ببێتە ئەندازیار؛ لەبەرئەوە بەردەوام هەوڵیان داوە حەزی نووسینو خۆتەرخانکردنی بۆ ئەدەب لەناخیدا بخنکێننو بیپووکێننەوە.

ئەمەش دەبێتە هۆی وروژاندنی ڕۆحی یاخیبوون لەلای پاولۆ کۆیلۆ، سەرەتا دەست دەکات بە شکاندنو تێکدانی ئەو یاساو ڕێسایانەی کە خێزانەکانی ئەو کات پەیڕەویان دەکرد، باوکی ئەم هەڵوێستەی کوڕەکەی بە یەکێك لە نیشانەکانی شێتیو نەخۆشی ژیری دەزانێت؛ لەبەرئەوە دەیباتە نەخۆشخانەی دەروونیو چەند جارێك چارەسەری کارەبایی بۆ دەکەن. دوای ئەوەو کاتێك پاولۆ کۆیلۆ تەمەنی دەگاتە حەڤدە ساڵان، پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵەی شانۆی لاوانەوە، سەرەتا وەك ڕۆژنامەنووسێك کار دەکات، بە بۆچوونی دایكو باوکی کارکردن لە شانۆدا، دەبێتە هۆی کانگای خراپەکاریو لێکهەڵوەشان. هەرلەبەرئەوەبوو کە باوكو دایکی پاولۆ کۆیلۆ، سوربوون لەسەر ئەوەی کوڕەکەیان پێویستی بە نەخۆشخانەی دەروونی هەیەو دەبێت ماوەیەك لەو نەخۆشخانەیە بمێنێتەوە، ئەوان دوو تا سێ جار بردیانە ئەو نەخۆشخانەیە، ئەوەش بووە هۆی شکاندنو لێدانو لەناوبردنی هیواو ئاواتەکانی پاولۆ کۆیلۆ، هاوکات ئەم چارەسەرو نەخۆشخانە دەروونیانە، نەك هەر نەبوونە چارەسەر بۆ گرفتەکەی پاولۆ کۆیلۆ، بەڵکو زیاتر لە جاران سەری لێشێواو باری دەروونی خراپتر بوو، دواتر باوكو دایکی لە هەوڵێکی بێهیوایانەدا کوڕەکەیان برد بۆ پزیشکێکی دیکەی دەروونی، دوای پشکنین، پزیشکەکە پێی ڕاگەیاندن: کە پاولۆ کۆیلۆ هیچ نەخۆشییەکی دەروونی نییە، پێویستە نەنێردرێتە نەخۆشخانەی دەروونی، تەنها ئەوەی پێویستە بۆی ئەنجام بدەن، ئەوەیە کە بە سادەیی فێری بکەن، چۆن ڕووبەڕووی ژیان ببێتەوە!

### جیهانێکی نوێ:

دوای ماوەیەك لەم یاخیبوونە، لە ناوەڕاستی شەستەکاندا بوو، پاولۆ گەڕایەوە بۆ خوێندن، بەشێوەیەك دەرکەوت کە دەستی کردووە بە شوێنکەوتنی ڕێگەیەکی ڕاست، کە باوكو دایکی مەبەستیانە لەو ڕێگەیەدا بێت، واتە: ڕێگەی درێژەدانو بەردەوامبوون لە خوێندن، بەڵام دوای ماوەیەك، دووبارە دەستی لە خوێندن هەڵگرتەوەو گەڕایەوە بۆ شانۆ!

ئەو کاتە سەردەمی بزوتنەوەی یاخیبوونی لاوانی جیهانی بوو، ئەم شەپۆلەش کاریگەریی خستە سەر وڵاتی بەڕازیل.

ئەو کاتەش بەڕازیل لەژێر چەپۆکی حوکمڕانی سەربازی ڕەگەزپەرستیدا بوو، پاولۆ پەیمانی دا، کە ناسنامە هەڵنەگرێت، ئیدی پاولۆ لەم تەمەنەدا بووە لاوێکی سەرکێشو زۆر کاری نایاسایی ئەنجام دەدا.. تا دواجار لەگەڵ وسیشاس پێکەوە گۆڤاری (Kring-ha) کە گۆڤارێکی وێنەدار بوو، لەو گۆڤارەدا بانگەشەیان بۆ سەربەستیو ئازادی زیاتر دەکرد، لەو کاتەدا دەسەڵاتداران دەستیان گرت بەسەر گۆڤارەکەداو هەردوکیان (پاولۆو وسیشاس) دەستگیر کرد، بەڵام هەر زوو هاوڕێکەی ئازاد کرا، بەڵام پاولۆ ماوەی زیندانییەکەی درێژەی کێشا؛ چونکە دەسەڵاتداران لەو بڕوایەدابوون، کە پاولۆ بەڕێوەبەرو خاوەن بیرۆکەی ئەو گۆڤارەیە، پاولۆ لەو بڕوایەدا بوو، کە دەبێت ئاوڕێك لە ژیانی خۆی بداتەوە، بەڵام ناحەزانی، هەواڵی ئەوەیان بەدەسەڵاتداران دا، کە پاولۆ نەخۆشیی دەروونی هەیە، چەند جارێك ناردیانە نەخۆشخانەی دەروونی، بەڵام دواتر ئازادیان کرد.

### ئەو کاتەی ژیان بۆت پێدەکەنێت:

ئەو کاتەی پاولۆ تەمەنی گەیشتە بیستو شەش ساڵ، دانی نا بەوەدا کە ئەزموونێکی زۆری لە ژیاندا لەدەست چووە، ئێستا دەیەوێت چارەنووسی بگۆڕێت، توانی پیشەیەك بۆخۆی دەستەبەر بکات لە کۆمپانیای (بولیگرام) هەر لەو کۆمپانیایەدا، بە خاتوونێك ئاشنا بوو، کە دواجار پێکەوە هاوسەرگیرییان کرد.

لە ساڵی ١٩٧٧ پاولۆو خێزانەکەی گواستیانەوە بۆ لەندەن، لەو شارە ئامێرێکی نووسینی کڕی، سەرەتا دەستی کرد بە نووسین، بێئەوەی بیر لەسەرکەوتن بکاتەوە، بەڵام دوای ساڵێك گەڕانەوە بۆ بەڕازیل،

وەکــوو بەڕێوەبەر لــە کۆمپانیای تۆمارکردن بە نــاوی (CBS)، بەڵام تەنها ماوەی سێ مانگ لە کارەکەی بەردەوام بوو، دواتر لە هاوسەرەکەی جیابوویــەوەو وازی لــە کارەکەی هێنا، دوای دوو ســاڵ گەیشــتەوە بە هاورێیەکی کۆنی بەناوی (کریســتیا اوبتنشــیکا)و هاوسەرگیری لەگەڵدا کردو تا ئێستاش بەردەوامنو پێکەوەن لە ژیاندا.

ســی ســاڵ تێپەڕی بەســەر ئــەو ســاتەدا، پاولــۆ کۆیلــۆ کتێبێکی نووســی بەناونیشــانی (فیرونیــکا بڕیاری دا بمرێت؟) ئــەم ڕۆمانە لە ســاڵی ١٩٩٨ لــە بەڕازیــل دەرکەوت، لە یەنایەری ســاڵی ١٩٩٩ ســیناتۆر (ئیدواردو سوبلیســی) لــە یەکێك لە دانیشــتنەکانی پەرلەماندا، چەند بەشــێکی ئــەم ڕۆمانــەی لەناو هۆڵــی پەرلەمــان خوێنــدەوە، توانی دەنگــی ئەندامانــی پەرلەمــان بەدەســت بهێنێــت لەســەر دەرکردنی یاســایەك لــە مــاوەی ١٠ ســاڵدا.. بەپێــی ئەو یاســایە ڕێگــری کرا لە هێشــتنەوەی زۆرە ملێــی نەخــۆش لــە نەخۆشــخانە دەروونییەکاندا!

کۆیلۆ لە ســاڵی ١٩٨٨ ڕۆمانی کیمیاگەری نووسی، چیرۆکی ڕۆمانەکە، باس لە گەشتکردنی لاوێکی ئیسپانی دەکات بە ناوی سانتیاگۆ بۆ وڵاتی میســر بە خەون، کــە دوای چەند خەونبینینێــك، گەنجینەیەك لەوێ دەدۆزێتــەوە. ڕۆمانی کیمیاگەر لە ســاڵی ١٩٨٨ چاپ کــراوە، بە تەواوی جیهاندا بڵاو بۆتەوە، بۆ زیاتر لە ٨٠ زمان وەرگێڕدراوەو تا ئێستا زیاتر لە ١٥٠ ملیۆن کۆپی لێ فرۆشــراوەو بەهۆی زۆری فرۆشییەکەیەوە، ناوی پاولۆ کۆیلۆ چۆتە کتێبی گینسەوە.

ئــەم ڕۆمانــە، بڕیار وایــە بکرێت بە فیلمو بچێتە ســەر شاشــەی ســینەماکانو وا بڕیارە لەم ســاڵی ٢٠١٦دا دەســت بکرێت بە وێنەگرتنی فیلمەکە. ڕۆڵی پاڵەوانێتیی ســانتیاگۆ لــە فیلمەکەدا دراوە بە ئیدریس ئەلباو فیلمەکەش لە دەرهێنانی لۆڕەنس ڤیشبۆرن دەبێت.

هاوکات ڕۆمانی کیمیاگەر بە ســێ وەرگێڕانی جیاواز لە کتێبخانەی کوردیدا بوونی هەیە.

### کۆیلۆ خەونەکەی دێتەدی:

نــەوەدەکان بۆ پایلۆ بووە ســاڵانی ســەرکەوتنو دەرکەوتنو بوو بە یەکێك لە ئەســتێرە ناودارەکانی جیهان، ژمارەی عاشقانی ئەو نووسەرە گەیشــتە ملیۆنــان کــەس لەسەرتاســەری جیهانــدا، کە لــە نێوانیاندا ئەســتێرە ناودارەکانی لە بوارە جیاوازەکاندا تێدایە، کە خاوەنی زەوقی جیاوازو پسپۆری جیاوازن، هەموان عاشقی نووسینەکانی پاولۆ کۆیلۆنو نووسینەکانی بەرز دەنرخێنن، لەوانە (مادۆنا وجولیاو ڕبرتس وامبرتو ئەکوی فەیلەسوف).

جگە لەو بەرهەمە ســەرکەوتووە، چەندین ڕۆمانی دیکەی نووســی لەوانە بریدا (Brida)، ڕووبارە بەخوڕەکە، پاولۆ کۆیلۆ چەندین گەشتی ئەنجــام دا بــۆ وڵاتەکانی ئاســیاو ئەوروپاو ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە مایۆی ٢٠٠٠ کۆیلۆ ســەردانی وڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات، ئەوەش بە یەکەم نووسەری بەناوبانگی ناموسڵمان دادەنرێت کە دوای ساڵی ١٩٧٩ سەردانی ئەو وڵاتەی کردبێت، سەبارەت بەو سەردانەی بۆ ئێران گوتی: من بە ژمارەیەکی زۆر لە دۆستو هەوادارانم گەیشتم لەم وڵاتە، ئەوەی من بە دیم کرد ئەوەبوو، کە تێگەیشتنێکی قووڵ هەیە لەم وڵاتە بۆ بەرهەمەکانم، بەڕاستی خۆشەویستییان لە ناخەوە هەژاندمی، ئەوەی سەرســامی کــردم، ئەوەیە کە پێش خۆم ڕۆحم گەیشــتۆتە ئەم وڵاتــە، کتێبەکانم لێرە بوونیان هەیــە، هاورێگەلێکی دێرینم بینی کە پێشــتر چاوم پێیان نەکەوتبوو، ئەوەش ئەزموونێکی قووڵە، بەڕاســتی ڕۆحم لێوان لێو بوو لە خۆشەویستی بۆ ژیان، هەستم کرد کە گفتوگۆو نووســین لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی سادەو ساکار، دەکرێت کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبێت، ئەمەشم لە وڵاتی ئێران بەدی کرد.

لە ســێپتەمبەری ســاڵی ٢٠٠٠ پەیمانگاکەی پاولــۆ کۆیلۆ دوای بووە پاڵپشــتو هاوکاریو یارمەتیدانی هەزارانی بەڕازیل، بەتایبەت منداڵانی بێسەرپەرشتیار.

کۆیلۆ بەهۆی توانا ناوازەکەیەوە، لە دەربڕینو نووسینو پەیامەکانی بۆ مرۆڤایەتی، هەروەها بەهۆی ئەو شــێوازە جوانە ئەدەبییەی کە هەر لەگەڵیــدا لەدایك بووبــوو، پاولۆ کۆیلۆ توانی چەندیــن خەڵاتی ناوازە بەدەســت بهێنێت، لەوانــە (ســوارچاکی هونەرو ئەدەب، لە فەرەنســا، دیاریکردنــی وەکــوو ڕاوێژکاری ســەروو پلەی ئاســایی بــۆ پرۆگرامی یونســکۆ بەنــاوی (کارلێکی ڕۆحی لە نێوان شارســتانیەتەکان، هەروەها خەڵاتــی BAMBI 2001)، بەدەســت هێنا کە کۆنتریــنو گرنگترین خەڵاتــی ئەدەبیە لە ئەڵمانیا، لە یۆلیۆی ســاڵی ٢٠٠٢ کۆیلۆ هەڵبژێردرا بۆ تەرخانکردنی کورســیی ژمارە ٢١ لە ئەکادیمیای بەڕازیلی بۆ ئەدەب، کە تێیدا وتارێکی پێشــکەش کرد کە وەســفی خــەونو باوەڕی کرد، لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی: بەدەستهێنانی ئەم پۆستە شەرەفێکی دیکە بوو، خەونێکــی تر بوو، کە لە مێژبوو چاوەڕوانــی هاتنەدی بووم، هەروەها گەیشــت بە زۆرێك نیشــانەو خەڵاتــی ڕێزلێنان لە فەرەنســاو ئیتالیاو ئێرلەنداو بەڕازیلو پۆڵۆنیا).

ڕۆمانەکانی کۆیلۆ بە ئاســانیو ســادەیی زمانو شێوازێکی زنجیرەیی جوان دەناســرێتەوە، کە دوورن لە ئاڵۆزیو خۆناچارکردن بە نووســین، کۆیلــۆ لەو بارەیەوە دەڵێت: دەتوانــم هەموو هەفتەیەك کتێبێکی ئاڵۆز بنووســم، بەڵام لەبــری ئەوە کتێبێکی ســادەو ســاکار دادەنێم لە دوو ساڵدا، کتێبێك بەبێ ڕازاندنەوەو زەخرەفەی ئەدەبی، بەڵکو لەبری ئەوە، هەوڵ دەدەم نووســینەکانم دیوارەکانی دڵی خوێنەر ببڕن، لەبەرئەوەی کە ئەگەر نووســینەکان ئاڵۆزبن، کــەس لێیان تێناگات، تەنها نەزانەکان وادەزانن کارە ئاڵۆزەکان سرووشــتی کەسە بلیمەتەکانە، لە پشت هەموو ئاڵۆزییەکەوە بۆشاییەکی ترسناك هەیە، لەبەرئەوە شێوازی نووسینەکانی من بەشــێوەیەکی سادەو ســاکارە، ئەوەش وای کردووە کە من بە زمانی سادەی نووسینەکانم، بگەمە ئەوپەڕی سنوور.

### هەندێك بەرهەمەکانی پاولۆ کۆیلۆ:

١. بەڵگەخانــەی دۆزەخ (Arquivos do Inferno)لەســاڵی ١٩٨٢
٢. زیارەت (O Diário de um Mago) لەساڵی ١٩٨٧
٣. کیمیاگەر (O Alquimista) لەساڵی ١٩٨٨
٤. بریدا (Brida) لەساڵی ١٩٩٠
٥. بەخششێکی باڵاتر ساڵی ١٩٩١
٦. گەورەترین دیاری (O Dom Supremo) ١٩٩١
٧. ڤالکیری (As Valkírias) لەساڵی ١٩٩٢
٨. بیرەوەرییەکانــی جادووگەرێــك (O Diário de um Magus) لەساڵی ١٩٩٢
٩. مەکتووب (Maktub) لەساڵی ١٩٩٤
١٠. چیای پێنجەم (O Monte Cinco) لەساڵی ١٩٩٦
١١. پازدە خولەك (Onze Minutos) لەساڵی ١٩٩٣
١٢. شەیتانو خاتووپریم ساڵی ٢٠٠٠
١٣. کۆمەڵێك حیکایەت بۆ باوان، منداڵانو نەوەکان ســاڵی ٢٠٠١
١٤. یازدە خولەك ساڵی ٢٠٠٤
١٥. زاهیر ساڵی ٢٠٠٥
١٦. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئاگرا ٢٠١٣
١٧. داوێنپیسی ٢٠١٤
١٨. وەکوو بەور بژی
١٩. ڕووبارە بە خوڕەکە ٢٠٠٦

### پۆستەکانی کۆیلۆ:

١- ئەندام لە پەیمانگای شیمۆن بیریۆ بۆ ئاشتی.
٢- ڕاوێژکاری یونسکۆ بۆ ئاڵوگۆڕی شارستانیو ڕۆحی.
٣- ئەندامی ئەکادیمیای ئەدەبی بەڕازیلی.
٤- ئەندانی کۆمەڵەی زمانەوانی بەڕازیلی.
٥- نێردراوی ئاشتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان.



# تۆ چ جۆرە باوکێکیت؟

ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد ..... و: خالید موحەممەد

**٢- نادیار: باوکی نادیار ..**

**باوکانی ون، یان نادیار کامانەن؟!**

زۆربەی کات، لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، ئەو باوکانەی کە نادیارن، لە ڕاستیدا ئەو کەسانەن کە متمانەیان بە خۆیان نییە، دوودڵن، بەدەست کەمیی هاوسەنگیو کامڵییەوە دەناڵێنن، خۆیان لە بەرگو کارە تەقلیدییەکانیان داڕنیوە، بەبێئەوەی بەرگێکی نوێیان داهێنابێت، زۆر پەیوەستی کارو بیروبۆچوونەکانی خۆیاننو بە خۆیان سەرسامن، هەروەك باوکی خۆسەپێن وان، بەڵام تەنها بە جیاوازیی ئەوەی کە ئەمان، واتە: باوکی خۆسەپێنو زاڵ- لەناو باسەکەدا ڕۆڵ دەبینن‌و بەگرنگییەوە پاڵپشتی دەکەنو سوورن لەسەر ئەنجامدانی ڕۆڵیان، بەبێئەوەی لێی ڕابکەن، لە کاتێکدا نادیارەکان وازیان لە ڕۆڵی خۆیان هێناوەو بەرگی پەروەردەییان لەخۆیان کردۆتەوەو بەلاشیانەوە کێشە نییە ئەو سستییەیان وایان لێ بکات ڕووتورەجاڵو پشتگوێخراوو حساب بۆ نەکراو بن..

(ئەو کۆمەڵگەیەی ئەم جۆرە باوکە زاڵە بەسەریدا، زیادبوونێکی ترسناك لە درووستکردنی خەڵوەتگەی پیری بە خۆیەوە دەبینێت، لەبەرئەوەی منداڵانی ئەو باوکانەش (باوکانی نادیار) بەهەمان شێوەی باوکیان وازیان لەبینینی ڕۆڵی سەرپەرشتیکردنی باوکە پیرەکان هێناوە، وازیان لە ئەرکەکانیان بەرامبەر بە باوکیان هێناوە.

**٣- ئاڵۆز: باوکی دایك!!**

لە دایکبوونی منداڵ، واتە: زیادبوونی تاکێکی تر لەناو خێزاندا، ئەم ڕووداوە، لەوانەیە هەندێك باوکان تووشی سەرسامیو ئاڵۆزی بکات سەبارەت بە ئەرکەکانیان بەرامبەر بە منداڵی ساوا، هەروەك تووشی لەدەستدانی هاوسەنگی دەبن؛ چونکە باوەڕ بەوە ناکەن بوونەتە باوكو نازانن چۆن مامەڵە لەگەڵ کەشی نوێدا بکەنو نازانن پێویستە چۆن دەستبەکار بن، ئەم ئاکارەش زیاتر تووشی ئەو کەسانە دەبێت، کە خاوەنی کەسێتییەکی سادەو ساکارنو متمانەیان بە خۆیان نییەو لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئامادەنین شان بدەنە بەر قورساییە جیاجیاکانی خێزانێك، کە ژمارەی تاکەکانی زۆر بێت.

لە بەرامبەر ئەم کەشە سەیرەدا، باوك خۆی لە بەردەم دوو هەڵبژاردندا دەبینێتەوە.. یان پاشەکشە، کە ئەمەش چینی باوکی نادیار دەگرێتەوەو پێشتر باسمان کرد، یان ڕۆڵی دایك کۆپی بکاتە سەر خۆی، وەك دایك هەڵسوکەوت بکاتو ئاکارەکانی ئەو دووبارە بکاتەوە، ڕۆڵی دایك ببینێت، ئەمە ئەو چینەیە کە زاراوەی (باوکی دایك)مان بۆ بەکار هێناوە.

**باوکی دایك کێیە؟!**

ئەم باوکە خاوەنی کەسێتییەکی لاوازە، متمانەی بەخۆی نییە، شپرزەیەو دوودڵە بەرامبەر ئەم کێشە نوێیە، بۆیە زۆر لاسارو زیادەڕەو دەبێت بەسەر دەسەڵاتەکانی کەسانی تردا، وا دەیبینی زۆر زانایەو پلە یەکە لە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە پەروەردەی منداڵو تەندرووستیو گەشەکردنیەوە هەیە، زۆر گرنگی بە ڕۆشنبیرکردنی خۆی دەدات، بەردەوام بیروڕاکانی خۆی دەخاتە ڕوو، ڕەخنە لە دایك دەگرێتو بەردەوام هەوڵ دەدات کارەکانی ڕاست بکاتەوەو ئاکارەکانی چاك بکاتو خۆی جێی بگرێتەوە ..وای لێ دێت بۆ هاوسەرەکەی دەبێتە ڕکابەرو دەستوورشکێن لە بوارە دیاریکراوەکاندا، جێگرەوەیە، نەك هاوکارو یاریدەر ... سەبارەت بە منداڵەکەش زۆر پێوەی پەیوەست دەبێتو زیادەڕەوی دەکات لە گرنگیپێدانو یاری لەگەڵکردنو ماچکردن.

**٤-توندوتیژی: باوکی شەڕەنگێز!!**

لەنێوان توێژەکانی باوکی ناباشدا، باوکی شەڕەنگێز هەیەو ئاکارێکی ناجۆریان هەیە، بەردەوام لە ململانێیەکی ئاشکراو بەردەوامی یەکلایەنەدان، ئەویش لایەنی باوکە، ئەم جۆرە لە باوك خۆی بە (پیاو) نابینێ، تەنها لەڕێی پەیڕەوکردنی توندوتیژیو خۆسەپاندنو هەڵەشەییو ڕاگەیاندنی شەڕ بەرامبەر بە منداڵەکانی نەبێ، پێی وایە کە پیاوەتییەکەی پەیوەستە بە توندوتیژیو دەمەدەمێو کێشەنانەوە کە دایدەمەزرێنێ لەگەڵ منداڵەکانیدا، لە میانەیەوە تواناو هێزو بازووی خۆی پیشان دەدات، بەم شێوازە پێی وایەوێنەیەکی نموونەیی باش، پیشانی منداڵەکانی دەدات. باوکی شەڕەنگێز، هەمیشە لەو میانەیەوە مامەڵە دەکات، کە منداڵەکانی دوژمنی ئەونو زۆر هەستیارە بەرامبەریان، وێنەی ئەم وەك وێنەی ئەو شۆفێرە وایە، کە هەموو شۆفێرەکانی دەوروبەری بە ڕکابەری خۆی دەزانێت لەسەر شەقامی کێبڕکێ، بۆیە هەموو ڕێگەکان دەگرێتەبەر؛ تا پارێزگاری لە پلەی یەکەمی خۆی بکاتو نەهێڵێت کەسیان پێشی بکەون، بۆ ئەمەش هەموو بیری لەلای ڕەفتارو شێوە جووڵانی دەوروبەرەکەیەتیو ڕووبەڕووبوونەوەیانە بە بەهێزترین شێوە، ئەم جۆرە لە باوك، بچووکترین هەڵە دەکەنە جەنگێکی گەرم لە نێوان خۆیانو منداڵەکانیانو چەندین جنێوو وتەی ناشرینی تێدا بەکار دەهێنن، ئەم ئاکارەش هیچ پەیامێکی پەروەردەییو ڕەوشتی پێشکەش بە منداڵەکان ناکات، نەك هەر ئەوە، بەڵکو دەبێتە مۆتەکەیەك بۆ منداڵە بچووکەکانو لە ژیانێکی پڕترسو دڵەڕاوکێدا دەیانژێنێت.

ئەو وشە نەشیاوانەی کە لەدەمی باوکی شەڕەنگێزەوە دەردەچێت، هەرگیز وێنەیەك نییە لە باوکی (پیاو)، بەڵکو وێنەیە بۆ لادانو دارمانی ژیاریو ڕەوشتی تاك، ئەو تاکەی کە ڕێز لە هەستی بەرامبەر ناگرێت، بە تایبەت گەر ئەو بەرامبەرانە یەکەم منداڵ بێتو دووەمیش منداڵی خۆی بن.




# دونیایەك لە سۆز..

کیژان فەرەج

ناخی پڕسۆزی دایك بە مرۆڤێکی بچووکی وەك من وەسف ناکرێت، دەزانم گەر بیرمەندترین مرۆڤو بە تواناترین نووسەر، بیەوێت لەسەریان بنووسێت، هێشتا ناتوانێت مافی خۆی بداتێ!

❖سەرەتا دەمەوێت بەم ڕووداوە دەست پێبکەم، بە ڕۆژێك لە ناو پاسدا، بەرەو ماڵەوە دەگەڕامەوە، لە پێشمەوە کوڕێکی هەرزەکاری تەمەن (١٤-١٥)ساڵ تەلەفۆنێکی بۆ هات، بەوپەڕی نا شایستەو زۆر نەشیاوانە دەیشیڕانو دەیگوت: ها دەی، دیسانەوە بۆ تەلەفۆن دەکەیت؟ چیت دەوێت؟ ئەی نەمگوت دەگەڕێمەوە؟.. چەندین وشەی نابەجێی تر! بە هاوڕێکەی تەنیشتی گوت: تو خوا ئەوە گوزەرانە! وازم لێناهێنێت.. پاش ئەوە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەستیان بە قسەی خۆشو گاڵتەوگەپ کردەوە! لەوێدا بەس خودا ئارامی پێبەخشیمو قسەم نەکرد؛ چونکە گونجاو نەبوو من لەوێدا قسە بکەم، سەیرم لێ دەهات کەسێکم هەست پێ نەکرد، لەناو پاسەکەدا سەرسوڕمانێك گرتبێتی!! قسەیەك بکات، وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێتو هەموو پاسەکە کشوماتی کردبوو! جا نازانم ئەوانیش تاسابوون، یان ئەو ڕەفتارەیان لا ئاسایی بوو؟ مرۆڤێك هێندە دڵڕەق بێت بەرامبەر بەسۆزترین بوونەوەرانی خودا (کە دایکە)، ئیدی چۆن بەرامبەر تالو کۆمەڵگاکەی، چاوەڕێی سۆزی لێ دەکەیت!؟

❖ دایەگیان، زۆۆۆرن ئەوانەی بە زمان دەڵێنو بە کردار ئەنجامی نادەن، بەڵام تۆ بە کردار زۆۆرت کردو بەزمان کەمت گوت، ئەی ئەو کەسەی لە کردارەکانتەوە فێربووم:

* مانای ئارامگرتن چییە؟ چون تا ئێستا کەسم نەدیوە هێندەی تۆ لە بەرامبەر سەختییەکانی ژیاندا، ئارامگر بێت.

* گەر لە هەموو خزمانت دوور بیتو تەنهاش بیت؛ هێشتاش لە هەموان زیاتر خاوەن کەسیت، گەر خودات هەبێت، بەپێچەوانەش (چون چەندان ساتی سەختت تێپەڕاند، کە جگە لە خودا، کەس هاودەمت نەبوو).

* هەموو کات وتەی جوان لە زارم بێتە دەرەوەو هەمیشە دەمبینیت، چەندە بە وشەی نابەجێ قەڵس دەبوویت.

* لێبوردەبم، چون هەموو کات، بەرامبەر ئەو هەڵانەی بەرامبەرم دەکردیتو دەیانکرد، لێبوردە بوویت.

* سەربەرز بژیم، سەر بۆ هیچ مرۆڤێك دانەنەوێنم.

* خۆشبەخت بژیم، چون فێری قەناعەتت کردم.

❖ گاڵتەم بە هەموو خۆشەویستییەکانی دونیا دێت، کاتێك بەراورد بکرێت لەگەڵ خۆشەویستیی تۆدا، ئاخر خۆشەویستیت بێبەرامبەرەو داوای هیچ پاداشتێکیش ناکەیت بەرامبەرت بکرێت، جگە لەوەی هەموو کات ئاواتتە، بەختەوەرترینو باشترین بوونەوەرەکانی خودا بین...خۆشەویستیت بۆمان، نە پێویستی بە سامانی ئێمەیە، نە بەجوانی، نە بەپلەوپایە... گەر هەژار بکەوین، گەر نەخۆشییەك بگرین، هەموان لەدەستمان ڕابکەن، گەر نزمترین پلەشمان هەبێت، هەموو کات باوەشە پڕمیهرەکەت بۆمان ئامادەیە! مەگەر هەموومان منداڵ نەبووینو لەوپەڕی پلەی بێدەسەڵاتیو نەفامیدا بووین، هەموو کات ئاگادارمان بوویتو شیرت پێ دەداین، جلوبەرگت دەگۆڕین، فێرت کردم کێمو ناوم چییە، خۆ من هێندە نەزان بووم، خۆشم نەدەناسی!

❖ دایەگیان، ئەو ساتەی دادەنەوەمو دەستە پڕنوورینو پاکەکانت ماچ دەکەم، گەورەترین شەرمو ترس دام دەگرێت! دەڵێم خودایە گەر تەنها لەسەر دەستە هیلاكو ماندووەکانی لێپرسینەوەم لەگەڵ بکەیت؛ ئەوا لەنێو دەچم! چ بگات بەو ڕەنجەی داویەتی لە پێناومان.

❖دایە گیان، ئەو ساتانەی بە نەخۆشیو ئازارەوە دەتبینم، ناخۆشترینو بەئازارترین ساتەکانی ژیانمە، ئەو ساتانەش زەردەخەنە پڕنوورینەکەت دەبینم، خۆشترین ساتەکانی ژیانمە. ئازیزەکەی ڕۆحمان، تۆ لەپێناو ئێمەدا زۆر ژیان، بەڵام ئێمە هەرگیز نەمانتوانیوە لە پێناو تۆدا بژینو مسقاڵێك لەو چاکەیەت بدەینەوە.. لێمان ببوورە دایەگیان بە سنگە پڕمیهرەکەت، وەك هەمیشە نزا باراناوییەکانت بەسەر دڵماندا بهێنەو لە خودا بۆمان بپاڕێرەوە، کە لێمان خۆش بێت، بەرامبەر ئەو کەمتەرخەمییانەی بەرامبەرت کردوومانە ...ئەی پارچەیەك لە سۆز، زۆۆۆۆرم خۆش دەوێیت، بەجۆرێك شەرم لە وتنی دەکەم؛ لەبەرئەوەی خۆشەویستیش کەمە بۆ دەربڕینو شایستەبوونت.



# کاتێك منداڵەكان گەورە دەبن

كارزان مەحموود

كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. چیدی ماڵ دەنگەدەنگو ژاوەژاوی تێدا نامێنێت، چیدی لەسەردیوارو دەرگای سەلاجەكەی ماڵدا وێنە پێكەنیناوییەكان چەسپ ناكرێن، یان هەڵناواسرێن.. كە بەدەستە بچووكە جوانەكانی خۆیان دروستیان دەكرد...

كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. دادەنیشم كتێب دەخوێنمەوە، بەبێئەوەی منداڵە بچووكەكەم بێت؛ تا لووتی بۆ بسڕم، یان كچە جوانەكەم بێتو دەستبخاتە سەر ئەولاپەڕەیەی كە دەیخوێنمەوە. كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. ئیتر پارچەسێو، یان هیچ خواردنێك لە خواری جێگەی نووستنەكانیاندا بەجێ نامێنن، ئیدی هیچ كەلوپەلێكی جوانكاری گرانبەهای ناوماڵ ناشكێن... كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. چیدی لەناو ئامێری مۆبایلەكەمدا، هیچ جۆرە یارییەك نابینرێت..

كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. ئیدی هیچ كات گوێبیستی ئەو قسانە نابمەوە، كاتێك لەنێوانیاندا دروست دەبوو؛ بۆئەوەی كە كامیان لەپێشدا بڕوات بۆ حەمام؛ تا دایكیان بیشوات..

كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. چیدی لە نیوە شەودا، هیچ كەس خۆی ناكات بە ژوورەكەماندا لە ترساندا، یان بەهۆی خەوی ناخۆشەوە، هەتا پەنای بدەینو ئارام بێتەوە..

كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. هەر كات بەبەردەم دووكانی یاری منداڵاندا تێ دەپەڕم، یان بەردەم دووكانی شیرینیدا، ڕاناوەستم؛ تا یارییەك بكڕم، یان شیرینییەك وەك جاران .. كاتێك منداڵەكان گەورە دەبن.. چیدی سكاڵاو شكاتی نێوانیان نابیستم، چیدی بەهۆی بەرزی تا لێهاتنیانەوە، ناگەمە نەخۆشخانە.. دەزانم كە ژیان تەواو جیاوازەو دەگۆڕێت، دەڕۆنو هێلانەو ماڵ جێدەهێڵنو بێدەنگی تەنیایی بۆمان جێ دەمێنێت.. بەڵام كاتێك دێنەوە لەگەڵ ڕۆڵەكانیاندا، دەگەڕێمەوە، بۆ یادگارییەكانی ڕۆژانی ڕابوردووەو جارێكی دی لەگەڵیاندا دەژیمەوە.. هۆن هۆن فرمێسك بەچاوانمدا دێتە خوارێ.. بۆیە دەڵێم: خۆشی وەربگرە لە گشت ساتەكانی ژیان، لەگەڵ منداڵەكانتدا؛ چونكە بەدڵنیاییەوە، ڕووداوەكانی ئەمڕۆ، دەبنە یادگاری بۆ سبەینێ...

سەرچاوە: سایتی حول العالم



# بەهـــار هـــات!

شۆخان عەلی

ئێـــمە هــەر لە چــاوەڕوانیی تــەواوبوونی زســـــتـــاندایــن! چ شــادییەکی لەگــەڵ خــۆی هێنا ئــەو بەهارە، چەنـــدە ماتو بێڕەنگــە ئــەم بەهــارەش! بە هەمـــوو واتایــەك بەهـــار واتە: لەدایکبوونـــەوە، واتە: جوانی، واتە: باشـــبوون، هەڵمژینی هەوای ئاســـوودەیی، گەڕانـــەوەی باڵنـــدەکان، ژیانـــەوەی متبـــووەکان، ڕۆشـــتنی هەورەڕەشـــەکان، ڕەشـــەباکانو تاریکییەکان، دەســـتو قاچی هەژارەکان، چیدی لەســـەرمان نالـــەرزن، پەلکەزێڕینە بە زەردەخەنـــەوە، لە گەمەی منداڵەکان دەڕوانێت، دڵۆپەکانی باران ئیتـــر مانـــای نەرمی دەزانـــن؛ بانگی گوڵەکان دەکـــەن کە چیتر نەترسن، بەڵکو بەئازادی بگەشێنەوە، لە سەروو هەموانەوە، خۆر دڵخۆشترینە؛ چون هۆکاری هەموو ئەمانە ئەوە! بەهۆی ئەوەوە، تەنانەت شـــاخەکانیش کراسی سپییان کردۆتە سەوز، زەوی ڕەقو خلیســـك نەرم بووەو چەندیـــن دیمەنی جوانی نەخشـــاندووە... ئەمانە هەموو چ شـــادییەك دەدەن! بەڵام ئەوە ئەو بەهارە بوو! ئەی ئەم بەهارە؟ ئەم بەهارە دەبێت چۆن بێت؟

ئاخـــۆ بڵێیـــت وێنەیەکـــی ڕوون بـــدات بەدەســـتەوە، دوای ئەو هەموو پشـــێویو ئاڵۆزییـــە؟ تۆ بڵێی بزانێـــت، کێ هەژارە؛ تا بتوانێت لەرزینی دەســـتو قاچیان لە ســـەرمان بوەســـتێنێت؟ یان لەم هەموو هەژارە ســـەری دەرنەچێـــتو هەڵبێت؟! تۆ بڵێی بتوانێـــت پەلکەزێڕینەیەك درووســـت بکاتو ئێمە لە ســـۆراغی پەلکەزێڕینەکانـــی ژێـــر زەوی بتوانیـــن ســـەر هەڵبڕیـــنو کاتی تێڕوانینیمان هەبێت؟ تۆ بڵێیت بتوانێت کۆتایی بەم زستانەمان بهێنێـــتو ئێمـــە ببینین؟ یان هەر لـــە چاوەڕوانیی تەواوبوونی زستاندا پاییزێکی تر سەر هەڵبدات! تۆ بڵێی کانیاوەکان دووبارە بتەقـــن، تا چیتـــر خەڵکی لەتـــاو تینوێتی بـــەرەو دەریاچەکان نەڕۆنو بخنکێن؟ ناکرێت کەســـێك وەڵامێکی لا نەبێت! لەکاتێك خۆمان بەرپرســـینو جێنشینین لەم ســـەر خاکە، ناکرێت هێندە بێئاگا بین! ئەرێ، دەزانم نیوەی نووســـتوون، زۆربەی ڕۆشتوون، هەندێـــك لێرە گوێیان گرتووەو هەندێکیش نایانەوێ ئەم بەهارە بێـــت، هەندێك چاوەڕوانو دەیانەوێ ئەوانەی کە ئەم بەهارەیان ناوێ، بۆیان بەرجەســـتە بکەنو بڵێن: فەرموو ئەمە تۆو ئەوەش بەهار! بەڵام کێ هێندە خۆبەخشە؟ ئەوە منو تۆین کە بەئاگاین، دەڕوانیـــن لێرەو ئاگادارین، دەشـــزانین بە چاوەڕوانیو ڕۆشـــتنو نووســـتن توانای بینینی هیچ دیمەنێکـــی بەهارمان نییە، بەڵکو پێویســـتە بەخەر بین؛ چون نە لە چاوەڕوانی بێهەوڵدان هیچت دەســـت دەکەوێـــت، نە لە کاتی نووســـتن ئـــاگاداری بەهارین، نە بە ڕۆیشـــتنو جێهێشـــتن ئەو لەدوامان دێت! ئێستا کە دەزانیت ئەو تۆ بانـــگ ناکات، بەڵکو چاوەڕێی ئامادەکاری تۆیە، دەیەوێت بێنیازبوونـــت لە هیچ کەس جگە ئەو کەســـەی کە هەموان پێی نیازمەندن! هەســـتەوەو پێکەوە ئەم بارەش بانگ بکەین، دەزانم ئاگاداریت کە دەستەوەســـتان نین؛ چونکە هیچ شتێك بۆ مرۆڤ مەحـــاڵ نییە! بەتایبـــەت مرۆڤێکی خاوەن بڕوا، پێویســـتە هەر یەکەو ســـەرکردەی خۆمان بین، نەك چاوەڕوانی ســـەرکردە بین، بەڕێوەبەری خۆمان بین، نەك بەڕێوەمان ببەن... هەموان ئاگادار بکەینـــەوەو فێری هێنانی ئـــەم بەهارەیان بکەین، دووبارە هەتاو بانـــگ بکەینو بڵێین ئێمە تامەزرۆتین زیاتر لە ئەو، بەهارە کە ئیتر هەستە! پێویســـت ناکات چیتر چاوەڕوانی تەواوبوونی ئەم زستانە بین.



# هەندێ جار دڵم بۆ پیاوان دەسوتێ!

مسعود محمد هانە ژاڵمی

هەنـــدێ کات لەگەڵ خۆمـــدا، هێندە بیر دەکەمـــەوە، کە وا دەزانـــم پیاوبـــوون، کارێکـــی ســـەختە، پیاوبـــوون خەمبارییەو زۆربوونی کێشـــەیە. هـــۆکاری ئەم بابەتـــەش ئەمەیە، کە دنیای پیاوان سەختو پڕلێپسراوێتییەو فشاری مادیو مەعنەوی بەدوای خۆیدا دێنێت، لەگەڵ ئەوەشـــدا هیچ کەس باس لە دنیای پیاوان ناکات. هیچ دەزگایەك باســـی مافی پیاو ناکات، هیچ ڕێکخراوێك نییە، کە باسی مافو داواکارییەکانی پیاو بکات لە ژن. لە کاتێکدا دنیـــای زۆربەی ژنـــان، بە یەکێك لەم پیاوانـــەوە گیری کردووە. یەکێك لە هەمان ئەو پیاوانەی کە ڕەنگە هاوبەشـــی ژیانت بێت، یان باوك، یان برات بن. بەهەر شێوەیەك بێت، خۆشیان دەوێین.

پیـــاوان حەز دەکەن خۆشـــترین ژیـــان، بۆ هاوســـەرەکانیان فەراهـــەم بکـــەن. یەکێك لـــە هەمان ئەو پیاوانەی کە هەمیشـــە ماندوون. ناچارن بە ڕاکردن. ڕاکردن بە دوای سەربازی، خوێندن، کاری باشو پەیداکردنی خانوو.. هتد. لەبەرئەوەی کاتێك دەچنە خوازبێنـــی، وا گومـــان دەبەن کە خوێندەواربـــنو خوێندبێتیان، پارەداربـــن، جوانو باڵابەرزو چوارشـــانە بن، بـــە هەبوونی ئەم تایبەتمەندییانـــە، تایبەتمەندییەکـــی گرنگیـــان دەبێت بە ناوی ڕەوشـــتجوانی، بەڵام ئەگەر ئەم تایبەتمەندییانە بوونیان نەبێت، بە شێوەیەکی تر لەگەڵ ئەمانەدا ڕووبەڕوو دەبینەوە.

وا دابنێیـــن کە ژنێـــك کابانیماڵەوەیەو ســـەرقاڵی کاری ماڵەوەیە. بەڵام چاوەڕوانی لە هاوســـەرەکەی کـــە بەیانی تا ئێوارە بۆ پەیداکردنی نانو فەراهەمکردنی ژیانێکی خۆش هەوڵ دەداتو کاتێك کە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، بەماندوویەتییەوە، دابنیشـــێتو قســـەی خۆشـــمان بۆ بکاتو لەوەیش سەیرتر ئەوەیە کە چاوەڕێ بکەیت لەم پیاوە، کە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو بێتو بیەوێت ژیانمان بەهەموو جۆرێ دابین بکاتو هەموو جارێ بمانبات بۆ سەیرانو کاتێك دڵمان تەنگ بوو، دڵدانەوەمان بکاتو هەمیشە بۆنی عەتری لێ بێت!!

کاتێـــك کـــە بڕیارە بەشـــداری لـــە میوانییەکـــدا بکەین، کە پەیوەندی بـــەوەوە نییەو بەڵام بەخاتری هاوســـەرەکەی دەبێت ئامادەیـــی هەبێتو بۆڵەبۆڵ لـــەکاردا نەبێتو هەر کەســـێك کە خۆشـــمان دەوێت، خۆشـــی بوێتو لەبیرت نەچێت کە هەمیشـــە هاوسەرەکەت لە وتەی خۆشەویستی بێبەش نەکەیت.

با بێینو باوەڕ بەوە بکەین، کە بەو شێوەی کە پیاومان نیشان داوە، وەهـــا خراپ نین. پیـــاوان بەدوای ئـــەوەوەن، کە بەئارامی بژینو هاوســـەرەکانیان ئەم خۆشەویســـتییەیان پـــێ بدات. تەنها کەمێ ئارامی، لە تەواوی ئەو فشارو دڵەڕاوکێیانەی کە بەخاتری خۆشحاڵبوون لە ئێمەی قەبووڵ دەکەن!

پیاوان دونیایەکی خەمگینو ســـەبوورانەی هەیە. دەبێت دان بەم خاڵەدا بنێین کە پیاوان خۆڕاگرییان لە ئێمە زیاترە. کاتێك پیاوان هـــاوار دەکەنو کاتێك وەڵامـــی تەلەفۆنەکانمان نادەنەوە، کاتێك عارەق بەجەســـتەیاندا دەچۆڕێت، هەر گوێمان لێ دەگرن. ژنەکانیش هەمیشـــە وا دەزانن کە پیاوەکان لەبەر خاتری خۆیان نایانەوێـــن. ئێمـــە وا هەســـت دەکەین، کە نەك ئـــەوان ئێمەیان بەخاتری خۆمان خۆش ناوێت! بەڵام ئەوان ئێمەیان خۆش دەوێت، بەخۆشویستنێکی ئاساییو مەنتیقی. باشترە ئارام بینەوەو مایكو تابلۆی ڕەخنەو گلەییەکانمان لابەرینو پڕوپاگەندە نەکەین.

بـــا بێیـــنو باوەڕ بـــەوە بکەین، کە بەو شـــێوەی کە پیاومان نیشانداوە، وەها خراپ نین!

لەوانەیـــە زۆرێك ناڕازیبن بەم نووســـینانەو لەگەڵیدا نەبنو لـــەم بارەیەوە قســـەیان هەبێـــتو بڵێن کە هەندێـــك لە ژنەکان بەخاتری دابینکردنی بژێوی خێزانەکەیان پێویســـتە کار بکەن، بەڵام لەبیرمان نەچێت، کە بژێویی خێزان لەئەســـتۆی پیاوانەو هیچ ژنێك لەبەر بژێویی خێزانی، ناچار بە کارکردن ناکرێت.

ئەم بابەتە بۆ خانمانە؛ بۆئەوەی بە چاوێکی ترەوە تەماشای پیـــاوان نەکەنو بـــاوەڕ بکەن ئەوان خۆشـــیان دەوێـــن، زۆربەی قسەکانیشـــیان بەخاتری ئێمەیە. ئێمە بەخاتری ژیانی هاوبەش تەحەممولـــی قســـەی پیاوان دەکەیـــن. بەڵام ئـــەوە لەهەمووی گرنگترە کە پیاوو ژن، بە چاوی سۆزو خۆشەویستییەوە تەماشای یەکدی بکەنو پێکەوە بژین.

باوەڕ بکەن کێبەڕکێو دژایەتی نێوان ئەم دوو ڕەگەزە بوونی نییەو باشترە بە پێکەوەژیانی هاوڕێیانە جێگەی بگرینەوە.

سەرچاوە: العلم نفس الزواج



بێگەرد فارس

# دەرمانخانەی پەروەردەیی

**منداڵەکەت درۆ دەکات؟** چارەسەر: دڵنیایی‌و ئارامی پێ ببەخشە؛ منداڵ درۆ ناکات، ئەگەر لەژێر فشاری هەڕەشـــەدا نەبێت، وای لێ بکە هەست بەئارامی بکاتو بەهای ڕاستگۆیی لەلا بەرزبکەرەوە.

**منداڵەکەت کەللەڕەقە؟** چارەسەر: لەو کاتەدا تۆش کەللەڕەقی لەگەڵـــدا مەکە، ئـــەوەی دەیبینێت جێبەجێـــی دەکات، ئامێزی بۆ بکەرەوەو خۆشەویستی زیاتری پێ ببەخشە.

**منداڵەکەت زۆر دەجووڵێت؟** چارەسەر: بە چالاکییەك سەرقاڵی بکـــە جووڵەی تێدا بێت، خواردنی شـــکۆلاتەی بۆ کـــەم بکەرەوە؛ چونکە چالاکی زیاتر دەکات، بەرپرسیارییەتێکی بخەرە ئەستۆ.

**منداڵەکـــەت باش ناخوات؟** چارەســـەر: هەرگیز تووڕەی مەکە، نانخواردنەکەی بۆ بگۆڕە بە یاری، یان کێبڕکێ لەگەڵ منداڵەکانی تردا، خواردنەکەی بەمیوەی ڕەنگاوڕەنگ بڕازێنەرەوە.

**منداڵەکـــەت لە خوشـــكو برا بچووکەکانی دەدات؟** چارەســـەر: لەگەڵ خوشـــكو برا بچووکەکانـــی بەراوردیان مەکە، با دەربڕینی خۆشەویستیت بۆیان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بێتو مەیلی دڵت بۆ یەکێکیان زیاتر نەبێت، لەچاو ئەواتی تردا.

**منداڵەکەت ئالودەی یارییە ئەلیکترۆنییەکانە؟** چارەسەر: وردە وردە کاتی یارییە ئەلیکترۆنییەکانی لێ کەم بکەرەوە، یەکســـەرو کتوپڕ لێی مەگرەوە؛ چونکە زیاتر لەجاران هۆگری دەبێت.

**منداڵەکەت وشـــەی نەشـــیاو بەکاردەهێنێ؟** چارەســـەر: هاوار مەکە بەســـەریدا، بەڵکو بە نەرمونیانی ئـــاگاداری بکەرەوەو پێی بڵێ زمانپاکی لە دڵپاکییەوەیەو هەوڵ بدە سەرچاوەکەی بزانیت.

**منداڵەکەت نوێژ ناکات؟** چارەسەر: سەرەتا خودای گەورەی لەلا خۆشەویست بکە، هەستی ئەوەی لەلا درووست بکە هەر نیعمەتێك تەنانەت ئەو پارەیەی یارییەکان، یان شـــیرینی پێ دەکڕێت، خوای گەورە پێی بەخشیوە.

**منداڵەکـــەت پەنجـــەی دەمژێت، یـــان نینۆکەکانـــی دەخوات؟**
چارەســـەر: منداڵەکەت پێویســـتی بە سەلامەتی‌و دڵنیایی هەیە، ئەو لە شـــتێك دەترسێت کە هەڕەشەیە بۆی، یان هەست بەکەمی خۆی دەکات، بەهۆی بەراوردکردنی لەگەڵ خوشكو براکانیدا، یان منداڵی تر.

**منداڵەکـــەت زوو تووڕە دەبێت؟** چارەســـەر: گرنگی پێ مەدەو بەهەمان شێوەی تووڕەیی ئەو، وەڵامی مەدەرەوە، فێری بکە کاتێك تووڕە دەبێت دەســـتنوێژ بگرێت، پێی بڵێ ئارام بەرەوە؛ بۆئەوەی لەیەکتر تێ بگەین.

**منداڵەکەت کەســـێتیی لاوازە؟** چارەسەر: متمانەی پێ ببەخشەو بەرپرسیارێتی پێ بســـپێرە، دڵنیای بکەرەوەو هەستی لاوازیی کەسێتی تێدا مەچێنە، بیخەرە یانەیەکی وەرزشـــی، لەبەرئەوەی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر لەش‌و دەروونی هەیە.

**منداڵەکەت ئەو نیشـــانانەی تیایە؟ ئـــارەزووی خوێندنی نییە، کتوپڕ بێ دەنگ بووە، نینۆکەکانی دەگەزێت؟ لە خەڵك دەترسێت؟**
لەوانەیە هێرشی کرابێتە سەر، بۆیە ئاگادار بن.

**منداڵەکەت کاتی قســـەکردن زمانی دەیگرێ؟** چارەســـەر: زۆر هانی بدەو ستایشـــی بکە، کاتی قســـەکردن پێی پێمەکەنەو پیشـــانی دکتۆری تایبەتی بدە، بۆ ڕاهێنانی لەسەر ڕاستگوتن‌و درکاندنی وشەکان.

**منداڵەکەت دەستو سەرت ماچ ناکات؟** چارەسەر: تۆ دەسپێشخەر بە؛ بۆئەوەی ئەویش لاساییت بکاتەوەو ڕابێت لەسەر ئەوە.

**منداڵەکەت دزی دەکات؟** چارەسەر: نازناوی دزی بۆ بەکار مەهێنە، بەڵکـــو کاتێك بەتەنهایە ئامۆژگاری بکـــەو پێی بڵێ ئەوەی هێناویەتی بیگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی‌و لەو هۆکارانەی وای لێ کردووە بکۆڵەرەوەو چارەسەریان بکە، لە ڕووی مادی‌و مەعنەوییەوە تێری بکە.

**منداڵەکەت نیشانەکانی پێگەیشتنی تێدا دەرکەوتووە؟**
چارەســـەر: ئادابەکانـــی خاوێنکردنـــەوەی فێـــر بکـــەو متمانەبەخۆبوونی تێدا بچێنە، گاڵتە بەدەنگو شێوەی مەکە، بۆی ڕوون بکەرەوە، ئەو بەرپرسە لە ڕەفتارەکانی.

**کوڕەکەت نیشانەی کچانەی تێدا دەرکەوتووە؟** چارەسەر: وردە وردە تێکەڵبوونی لەگەڵ کچاندا کەم بکەرەوەو لەگەڵ خۆت بیبەرە دانیشـــتنەکانی پیاوانەوە، ئەمەش پێچەوانە بکەرەوە، بۆ کچەکەت ئەگەر ڕەفتاری کوڕانەی کرد.

**منداڵەکەت کاتی لە خەوهەڵسانی دەگری‌و کەللەڕەقی دەکات؟**
چارەسەر: بەهێمنی دەست بەسەریدا بهێنەو بە خۆشترین ناو بانگی بکە، بەهێواشـــی ئایەتەلکورسی بەسەردا بخوێنە، دووربە لە هاوارکردن بەسەریدا.

**منداڵەکەت لە فرۆشگاکانی یاریی منداڵاندا دەگری؟** چارەسەر: سەیری چاوەکانی بکەو بەبێ هەڵچوون بیدوێنەو گفتوگۆی لەگەڵ بکـــە، داواکەی بەجـــێ مەهێنە، تەنانەت ئەگـــەر بێدەنگیش بوو؛ بۆئـــەوەی فێری ئەو ڕەفتارانە نەبێـــت، پێی مەڵێ ئەگەر بەگوێم بکەیت؛ پارەت پێ دەدەم، یان فلان شتت بۆ دەکەم؛ چونکە دواتر فێری بەرتیل‌و کارکردن بە بەرامبەر دەبێت.

# لیژنه

و/ ئیبراهیم بەهائەدین خەتەیی

لەبەرئــەوەی ســکاڵاکان، ســەبارەت بە دزیو گەندەڵــی زۆر بوون، لیژنەکەمــان کــە لــە پێنــج کــەس پێکهاتبوویــن، بــۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ســکاڵاکان ڕاسپێردرا، خۆدزینەوە لە حکوومەتو نەدانی باج.. باشــە لەوانەیە بڵێین، ئەوە بابەتێکی هێندە گرینگ نییە، لەبەر ئەوەی (کشمیر بەگ) تاکە کەس نییە، کە خۆی لەباج دەدزێتەوە.

بــەڵام ئەی ســەبارەت بــە کەمکردنــەوەی کرێی کرێــکارەکان چی؟ ئەی ســەبارەت بــەو کرێکارانەی بەهۆی کارکردنــەوە، زامداربوونو هیچ قەرەبوویەکیــان نەکراوەتــەوە؟ ئــەی دەســتدرێژیکردنە ســەر کرێکارە ئافرەتەکان، چۆن پشتگوێ بخەین؟! باشە لەوانەیە بڵێن هیچ خاوەنکارێکیش نییە ئەو کارانە ئەنجام نەدات! بەڵام بگاتە ئەوەی کە لەجیاتی قەرەبووی مردنی کرێکارێك، هاوســەری کرێکارە مردووەکەو کوڕەکەی، لە کارگەکەی خۆی کار پێ بکاتو ئینجا دەستدرێژیشیان بکاتە سەر!!

ئێمــەی ئەندامانــی لیژنەکــە، گەنجــی خوێنگــەرم بووینو زۆر تامــەزرۆی ئەوە بووین، کە کارەکانمان بەوپەڕی بەرپرســیارێتییەوە ئەنجام بدەینو گڕوتینی نیشــتیمانپەروەریو دەستپاکی لە ناخماندا بڵێسەی دەکرد.

سەر لەبەیانییەکی زوو بەڕێ کەوتین، لە دەرگای دواوەی کارگەکە پێنج کەس لەپێشوازیماندا بوون، دوای ئەوەی لە دەروازەکە چووینە ژوورەوە، بە هاوشێوەی پشکنەرێکی ڕاستەقینە گوتم:

-دەمانەوێــت چاومان بە (کشــمیر بەگ) بکەوێــت.. بەڕێوەبەری کارگێڕی، بەنەرمی وەڵامی دامەوە:

- بەڵێ، بەڵێ، بێگومان..ئاغا چاوەڕێتان دەکات..

- ئەو بەهاتنی ئێمە ئاگادارە؟

- بێگومان.. مەگەر دەکرێت جەنابیان ئاگادار نەبن!

فەرموون کەمێك پشوو بدەن.. فەرموون لێرەوە..

کاتێك ویســتمان هۆکاری ســەردانەکەمان بخەینە ڕوو، بەرلەوەی قســە بکەین، گوتی: ئێمە دەزانین گــەورەم.. هەرچییەك داوا بکەن، ئامادەیە. بەڵام سەرەتا پێویستە قاوەیەك بخۆنەوە.

-نەخێر.. ســوپاس، باشــتر وایە دەســت بە کارەکانمــان بکەینو چاومان بە کشمیر بەگ بکەوێت.

زۆر باشــە، ئێســتا جەنابیان دێن، بەڵام خۆ بەم شێوەیە نابێت!! شەربەتێك، شتێکی سارد ناخۆنەوە؟!

نەخێــر، تەنانەت ئاویــش ناخۆینەوە، لە کارگــەی پیاوێکی ئاوا گەندەڵو دزێو!

پێویســت بوو ئەو ســەردانەمان لەنــاکاو بێت، بــەڵام پلانەکەی ئێمەیان هەڵوەشاندەوە.

دەرگایەکە کرایەوە، پیاوێکی پۆشــتە هاتە ژوورەوە، ورگی بەسەر پانتۆڵەکەیــدا شــۆڕبووبوویەوە، لەگــەڵ هاتنــەژوورەوەی، هەمــوو فەرمانبــەرەکان، بە هاوشــێوەی ســپرینگێك لەشــوێنی خۆیان بەرز بوونــەوەو بەرەو پیری چوونو بەڕێزەوە بەدوایەوە وەســتان، لەگەڵ بەرزبوونەوەی فەرمانبەرەکان، خۆمان بینییەوە کە ناچارین شــێوەی دانیشــتنی خۆمــان بگۆڕین، بۆیــە منیش هەر هێنــدە قاچی خۆم، کەمێك لەیەکتر نزیك کردنەوە.

کشــمیر بــەگ، لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ڕووی لــە ئێمە کردو وەك ئەوەی بە شــێوەیەکی ئاسایی پێشــوازیمان لێی کردبێت، ئاماژەی بۆ ئێمەکردو گوتی: ببوورن منداڵەکان، ئەزیەت مەکێشن، تکایە فەرموون دابنیشن. ئەوە زۆر بێزاری کردم، کە بە منداڵ ناوی ئێمەی هێنا، ئەو بێڕێزییە چییە؟ هەربۆیە منیش، قاچم نایە سەرقاچ.

کشمیر بەگ، زیاتر لێمان نزیك بوویەوەو گوتی:

منداڵەکان، پێم بڵێن حاڵتان چۆنە؟ چی هەیە؟ چی نییە؟

لە هەواڵی ئێمە دەپرســێت، وەك ئەوەی ســاڵەهای ساڵ، هاوڕێی باوکمان بووبێت، بەڵام دەبێ دەرســێکی پێ بــدەم، بەدرێژایی ژیانی لەبیری نەکات، هەستامەوە سەرپێو گوتم:

- ئێمــە بە ئەرکێکی فەرمی هاتووین؛ بۆئەوەی پشــکنین ئەنجام بدەین، چەندین ســکاڵامان لەبەر دەســتن، کە تاوانبــارت دەکەن بە دزیو گەندەڵی، هاتووین؛ تا لێکۆڵینەوەی تێدا بکەین.

دایە قاقای پێکەنین، وەك ئەوەی گاڵتە بە قسەکانم بکاتو گوتی:

باشــە، ئاسانە، ئاســانە..نا!!! کەواتە: بەو شــێوەیە! ئینجا ڕووی لەبەرپرسی کارگێڕی کردو گوتی:

ڕیزی میوانەکانتان ڕاگرتــووە؟ ئەویش وەك ئەوەی تاوانباربێت وەڵامی دایەوە: گەورەم، ئەوان ڕەتیان کردەوە، هیچ شتێك بخۆن..

بێگومــان ئــەوان ڕەتــی دەکەنــەوە! کــوڕم ئەوانــە میوانــن، خواردنەوەیان بێنن!! ئێمە بۆ پشکنین هاتووین، ئێمە لیژنەین. هیچ شتێك ناخۆینەوە.



به پێکەنینەوە، لێمان نزیك بوویەوەو گوتی: بێگومان گیانەکەم، کێشەمان نییە.

-کاتی ئەوە هاتووە ئەرکی خۆمان ئەنجام بدەین. کشمیر بەگ بە هێمنی وەڵامی دامەوە: زۆر باشە.. بەڵام هەردەبێت شتێك بخۆنەوە. فەرموون ..کۆکتێلی میوەمان هەیە.. تکایە فەرموون.

لەو کاتەدا ڕووی پرسیاری لە ئێمە کردو گوتی:

- ئەو وێنانەی سەردیوار دەبینن؟ سەیر بکەن.. پڕن لە یادەوەری .. کاتێـك تێبینـی کرد، ئێمە هیـچ بایەخی پێ نادەین، بەدەسـتی ئاماژەی کردو بانگی کردین:

- وەرن سەیر بکەن.. ئەم وێنەیە لە سەختترین ڕۆژەکانی جەنگدا گیراوە.. ئاخ چ ڕۆژانێك بوو منداڵەکان، ڕۆژانی شاخ.

نیگامان لەسـەر وێنەکە نیشـتەوە، لەو کاتەدا هاتـە نێوانمانو دەستی لەسەر شانمان دانابوو.

منداڵـەکان!! ئەوەیـان وێنـەی بەرپرسـێکی باڵای ئەو سـەردەمەی ئێستامانە. بەدەستنووسی تورکی کۆن، لەسەری نووسراوە (بۆ برای ئەزیزم کشـمیر)، ئەو کاتە زۆر لەیەکەوە نزیك بووین.. چ ڕۆژانێك بوون، ئینجا بەهۆی هەردوو دەسـتییەوە، هەر پێنجمانی بە هاوشێوەی بەچکەمراوی بـەرەو دیوارەکـەی ئەوبـەر پەلکێش کردیـن، بەهـۆی گۆچانەکەیەوە، ئاماژەی بۆ شوێنەکانی سەر نەخشەکەی سەر دیوارەکە دەکرد.

ئێـرە پێی دەڵێن (Geyve) دوو لای شـاخەو لەناوەڕاسـتەکەیدا دۆڵێـك هەیە.. لە هەردوو لاوە، دوژمن هێرشـی دەهێنا، وەك خەیاڵ وابوو، بەچەکو پێداویستییەکی کەم شەڕمان دەکرد.

یادەوەرییەکانی خۆی لە ڕۆژانی شاخ بۆ ئێمە دەگێڕایەوە، بەڵام بە جۆرێك لە حەماسو هەڵچوونەوە قسـەی دەکرد، تەواو کاری تێ کردم. ئەو بەردەوام بوو لە قسەکانی: ئەوەش وێنەی خۆمە لەگەڵ مستەفا.

مستەفا کێیە؟

بەسەرسامییەوە سەیری کردەو گوتی: چەند مستەفامان هەیە؟!!

ئیتر بەو شـێوەیە لەبەرامبەر هەر وێنەیەکدا دەوەستا؛ بۆئەوەی ناوەڕۆکەکەی شـی بکاتـەوە. ئێمـەش تامەزرۆبووین کشـمیر بەگ بەردەوام بێت، چاومان پڕبوو لە فرمێسك.

منداڵـەکان.. ئیتر بەو شـێوەیە تێکۆشـانمان کـردووە؛ بۆئەوەی وڵاتێکی ئازادو سەربەخۆ بۆ ئێوە بونیاد بنێین.

لەناکاو ساتێك بێدەنگ بوو، ئینجا بەردەوام بوو، گوتی:

منداڵەکان، دەترسم ئێوەم بێزار کردبێت..

ئەندامـی دارایـی گوتـی: ئەسـتەغفیروڵڵا، قوربـان، ئێمـە لە جەنابتانەوە فێر دەبین.

- ئێوە لەو یادەوەرییانە پەند وەربگرن. باشە ئێستا با بگەڕێینەوە سەر کارەکەمان.

بـەڵام ئەندامی دارایی لیژنەکەمان گوتی: تکایە قوربان، بەردەوام بن.. (چی ڕوو دەدات!!!) .ئەویش بەردەوام بوو:

-فەرموون؛ با کەمێك لە ژوورەکەم دابنیشین، ئیتر قسەکان تەواو نابن.. ڕۆژێك فەوزی پێی گوتم..

-فەوزی کێیە؟

چەناگەی منی گرتو گوتی: تەمەنت چەندە؟

-بیستو هەشت ساڵ.

-مافی خۆتە کە نایناسیت، تۆ ئەو کات ئەسڵەن لەدایك نەبوویت!

بەدەسـتی ڕاسـتی چـاوە چرچەکانـی سـڕییەوەو سـەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد:

منداڵەکان درەنگ کەوتین! لەکوێ نانی نیوەڕۆ بخۆین؟

قوربان.. ئێمە دەبێت....قسەکانی منی بڕیو گوتی:

کوڕی خـۆم.. مەگەر دەکرێت نان نەخۆن! من لەشـوێنی باوکی ئێـوەم. نـان خواردنەکەمـان دوو کاتژمێری خایاند، لـەو ماوەیەدا، بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان.

ئەندامێکمان بەئەسپاییەوە گوتی:

ئەوە چ بێسـیفەتییەکە- هێشـتا کەسـێك هەیە قسە لەسەر ئەو پیاوە نازدارە بکاتو سکاڵای لەسەر تۆمار بکات؟!

- بەڵێ، ئیتر ئێمە ئاواین. گەڕاینەوە بۆ کارگەو کشمیر بەگ گوتی: با سەرەتا قاوەیەك بخۆینەوە، ئینجا دەست بەکارەکانمان دەکەین.

بەڵێ منداڵەکان. هەموو ئەوەی کردوومانە بۆ ئێوە بوو.

لـەدوای تەواوبوونـی جەنگ، جارێکیان (مسـتەفا) بانگهێشـتی کردەو گوتی: (کشمیر، لەمە بەدواوە کارگە دروست دەکەین، ئەوەش پێویستی بەڕۆڵی کەسانی هاوشێوەی تۆیە).

ئای خوایە، ئێمەی سـەرباز، پارەمان لەکوێ بوو، کارگە درووسـت بکەین؟!

ئینجـا گوتـی: باوەڕتان هەبێت، منداڵەکان ئێمە چەندین سـاڵ خەباتی شاخمان هەیە، بەڵام هیچ لەبارەی پیشەسازیو بازرگانییەوە نازانیـن!! بەڵام ناچاربووم، ئـەوە ئەرکێکی نیشـتمانییە. ئیتر بەو شـێوەیە ئەم کارگەیە لەدایك بوو، دواتر ئێمەیان بردە شـوێنێك، کە چەندین وێنە هەڵواسرابوون.

ئەوانە شەهیدانی ئێمەن، شەهیدانی کارگە..

بەچاوی بەفرمێسـکەوە گوتـی:- (کرێکارەکانی مـن، کە بەهۆی کارکردنـەوە شـەهیدبوون. گۆڕی تایبەتی شایسـتەم بـۆ هەموویان درووست کردووە، خانەوادەکانیشیان لەژێر چاودێری خۆم دادەبن).

- قوربان، ئەوانە هەموویان بەهۆی کارکردنەوە شەهیدبوون؟

- بژی نیشتمان!

- بەڵێ، بژی نیشتمان!؟؟

بە دەستەسـڕەکەی، فرمێسکەکانی سـڕییەوەو بانگی بەڕێوەبەری کارگێڕی کرد.

ئەو شوێنە هی من نییە، هەموو دەفتەروو تۆمارەکانی کارگەکەیان بۆ بێنن؛ بۆئەوەی کاری خۆیان بکەن.

ئینجا ڕووی لە ئێمە کردو گوتی:

کاتێك لەکارەکانتان تەواو بوون، وەرنەوە بۆ لای من..

وردبینییـەکان سـێ ڕۆژیان خایانـد، لەو ماوەیەدا هیچ شـتێك نەمایەوە لە کشمیر بەگ فێری نەبین لەبارەی شۆڕشی شاخ.

بەو شێوەیە، لیژنەکە گەیشتە ئەو دەرەنجامەی، هەموو سکاڵاکان دوورن لە ڕاسـتیو هیچ بنەمایەکیان نییە، ئینجا دوای نووسینەوەی ڕاپۆرتەکـە، بەشـەرمەزارییەوە چووین بۆ لای کشـمیر بەگو داوای لێبوردنمان لێ کرد.

پێکەنینێکی باوکانەی لێ بەرزبوویەوەو گوتی:

ئەو شـتانە ڕوو دەدەن.. بژی نیشـتمان.. هەموو شـتەکان دێنو دەڕۆن، تەنیا نیشـتمان سـەلامەت بێت. ئێمە هیچمـان ناوێتو ئەو نیشتمانە بۆ ئێوە جێ دەهێڵین.

کـە هاتینە دەرەوە، بەجۆرێك دڵخۆش بووین، وەك ئەوەی خۆمان خاوەنی ئەو کارگەیە بین، ئیتر کشـمیر بەگ بە ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆی ئێمەی گەیاندەوە فەرمانگەکانمان.

(عەزیز نەسین)

# ئاوێنەی دڵ

دەزانم، هەمیشە خۆشیت لە هەورە ڕەشەکان نەدەهات، ڕۆژە تەماوییەکان خەم دایدەگرتیو دڵت تەنگ دەبوو!

تۆ دەتەوێ، هەمیشە خۆرت لێ دیار بێت!

حەز دەکەی، هەمیشە ئاسمانی شین ببینی!

پێت ناخۆشە، پەڕەی گوڵەکان، گەردیان لێ بنیشێ!

بارانت خۆشەوێ، وەلێ لافاو نا!

بەفرت خۆشەوێ، وەلێ شەختەو سەرما نا!

سروەت خۆشەوێ، وەلێ ڕەشەبا نا!

بێدەنگیت خۆشەوێ، وەلێ تەنیایی نا!

بەهارت خۆشەوێ، وەلێ هێندەی مەحبووبەکەت نا!

چونکە ئەو، هەمیشەبەهاری تۆیە، هەر کاتێك نوورو ڕوخساری ئەو پەیدا دەبێت؛ ئیدی بەهاری دڵی تۆیە!

بەهارە فەسڵی زستانم، ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
درۆیە، گەر وتوویانە: بە خونچەیەکی بەهار نایە

- هێمن -

دەزانم، دەتەوێت دەستی ڕۆحت بگریو بە هەموو جیهاندا بفڕی!

گوێ لە دەنگی تاڤگەکان بگریو پەڕەی هەموو گوڵەباخەکانی دونیا، بکەی بە ملوانکە بۆ بەرۆکی ئەویندارە گەورەکەت!

دەتەوێت، لە ڕۆخی دەریا بژیو ببیتە هاودەمی کۆترو نەورەسە سپییەکان!

دەتەوێت، دەریاکانی دونیا، هەموو بکەی بە گوڵاو!

ئاخر تۆ، لە هەر شوێنێکدا گوزەر بکەی، بە نەسیمی میسکو عەمبەر، گوڵاوپرژێنی دەکەی، ئەی گوڵەندام!

ڕائیحەو بۆنی بەهەشتە، نەشئەبەخشی ڕۆحمە
یاخو خەندەو پێکەنینی لێوی لەعلی دولبەرە

- ئەوڕەحمان بەگی بابان -

هۆ تریفەی مانگی شەوانی تەنیاییم، منیش حەزم دەکرد هەموو تەمەنم سەفەربووایە بۆ لای تۆ!

کەشکۆڵێکم پێ بێ، پڕ لە گوڵی سوورو سێوی سەوزو ڕەشەڕەیحانە!

پڕ لە ئەوین!!

دەمەوێت بێمو نەگەڕێمەوە، بێیتو نەڕۆی!

چیرۆکی هەزارو یەك شەوەم بۆ بگێڕەوە! منیش وەك قوتابییەك، گوێت بۆ دەگرم!

قوتابییەکی شەیدا، یەکە یەکە پیتەکانت هەڵدەمژم!

یەکە یەکە هەناسەکانت دەژمێرم!

دەچینە سەر کانییەك، لەژێر سێبەری دارهەنجیرێکا دادەنیشین!

وەلێ چیرۆکەکانی ئێمە، ئەفسانە نین، داستانی ئەوینێکی نەمرن، ناسنامەی ڕۆحو هەوێنی مرۆڤن!

شەونامەی شەوانی دووریو سالانی چاوەڕوانیو ترپەی دڵی ساتەوەختی ویساڵن!

چرپەی فەنابوونو ئاوازی بێدەنگیو سوکنایی ڕۆحن!

سەرچاوەی ئیلهامو ئۆخژنی دڵن!

ماهی شەوئارام بەخەندە هات، نیقابی کردەوە
ئاسمان، ئەزمی سورەیا، شەوقی مەهتابی شکا

- وەفایی -

ئەو کاتەی مرۆڤ، دەتوانێ بێ پیت بدوێ! بە زمانی گوڵ گوزارش بکاتو لە نیگایدا مێژوویەك بخوێنرێتەوە، ئیدی ڕۆح، وانەی ئادابی مەحەببەت دەخوێنێ!

چونکە وەك مەولانای ڕۆمی دەڵێت: لە ئەوینەوە، ڕۆح هەزار جۆر ئەدەب فێر دەبێت، کە هەرگیز لە هیچ قوتابخانەیەك چنگ ناکەوێ!

ئیدی چی دی بۆ من گرنگ نییە، لەوێدا دەگەین بە ئاوێنەی دڵ، ئەو ئاوێنەیەی کە تەنها لەنێو ئەودا، خۆم دەبینمو خودی خۆم دەدۆزمەوە!

هاوار دەکەم، دەڵێم: وەرە
وەرەو ئەمجار منیش بەرە
بمبەوە جێی لەبیرکراو
دنیای زوڵاڵو پاکی ئاو

- ناسری حیسامی -



ڕێژنەی بارانەکە ڕانەدەوەستا، کەون هەموو ئاوی لێ دەچۆڕا، ئاسۆ بەرگی کریستاڵی لەبەر کردبوو، وشکێك نەمابوو، تەڕ نەبووبێ، هێلانەیەك نەمابوو، پرووشەی بارانی نەگەشتبێتێ!

ڕێژنەی بەردەوامی بارانەکە، ڕەوەچۆلەکەکانی زووتر ڕووەو هێلانە چکۆلەکانی خۆیان ڕەوانە دەکردەوە، دڵنیام ئەمشەو، ئاو دزە دەکاتە ناو دەواری کۆچەرانو زۆر لانەی گەرم سارد دەکاتەوە!

لەم شەوە ساردەدا، تەنها دڵە گەرمەکان بەرگە دەگرن!

ئەوانەی هەمیشە باوەشی گەرمیان هەس، چ لەنێو سەرماو وەیشوومەی زستانێدا بن، یان لەنێو گوڵستانی بەهاری!

ئەوان، گڕی ئەوینێك لە ناخیاندا داگیرساوە، کە وەکو نالی وەسفی دەکات:

لە دڵدا ئاتەشی عیشقت، بڵێسەی میسلی تەندوورە
شەتی ئەشکم نەبێ مانیع، دەسووتێم دەبمە کۆی نوورە

خۆزگەم بەو دڵانە ئازیزم، دڵی ئێمە بە هەزاران لافاوو شەستەبارانی بەهاری ناخوسێ، وەلێ دڵی ئەوان، بە گڕی ئەوینی خودایی بۆتە ئاوریشم!

سەدای نمەی ئەسرینو گزەی دڵی بەفرینو زایەڵەی ئاوازی﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾و چریکەی ﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ تەختو تاراجی دڵ، دێنێتە لەرزین!

چ پەنایەکی مەزنی پەروەردگار!! چ هێزێکی گەورەی کردگار! خاوەنی چ عەتایەکی بێسنووری ئیلاهی!

چ بەندەیەکی گوناهبارو کەساسم، هێندەی چۆلەکەیەکی تەڕی بێزمانی بەر ئەو بارانە، نەمتوانیوە سوپاست بکەم!

هەموو باڵندەکانی دونیا، هێندەی من دنیایان نەداوە بە کۆڵیاندا!

چی دەبوو، منیش وەکوو ئەوان، ئێواران بە دوو سێ دەنکە گەنم ڕازیبامو لە هێلانەیەکی چکۆلەدا، ڕووەو ئاسمان چاوەکانم لێکنان؟!

یەقینم هەبا، کە ئەگەر بژیم، خواردنی سبەییم لەسەر وییەو ئەگەریش بمرم، نوێژی سبەینێم لەسەر نییە!

وەلێ هێندەی چاوم لە ڕزقی سبەیە، هێندە نوێژی ئەمڕۆم ئەدا نەکردووە!!

پرسیار لە مەعرووفی کەرخی کرا: خوداویستان، چۆن ئاوا توانان لەسەر عیبادەت؟

لە وەڵامدا گوتی: بە دەرچوونی دونیا لەنێو دڵیان، خۆ ئەگەر دونیایان لەنێو دڵ با، نەیاندەتوانی یەك سوجدەی ڕاستەقینە ببەن بۆ خودا!!

کاتێك دڵ، دەبێتە دیوانی ئەوینی خودایی، ئیدی ڕێگا بە خۆشەویستی دونیای فانی نادات!!

لەنێو کووچەو کۆڵانی دونیای فانیدا، ون نابێت!

ڕێگە نادات، ساتێك تەمەنی، دوور لە یادی مەحبووبی دڵی، بگوزەرێ!

ئەو ساتەی سایەو سێوەری میهری خودایی دەدۆزێتەوە؛ ئیدی خەیاڵی ئاسوودەو دڵی ئارامە!

چونکە دەزانێ، بێ دڵنیابوون بە خەڵاتی ئەو کردگارە؛ ژیان جگە لە حەسرەتو پەشیمانی، چی دی نییە!

حەسەنی بەسری دەڵێت: هەموو بنیادەمێك، بەسێ حەسرەتەوە، ماڵاوایی لە دونیا دەکات!

حەسرەتی ئەوەی کە نەیتوانی لەزەت لە هەموو ئەو شتانە وەربگرێ، کە هەموو تەمەنی، لە کۆکردنەوەیدا سەرف کرد!

حەسرەتی ئەوەی کە نەگەیشتە هەموو هیواو ئاواتەکانی، حەسرەتی ئەوەی کە نەیتوانی، توێشووی قیامەتی ئامادە بکات!

نالیش دەڵێت:

عومرت نەفەسێکی، کە هەموو عالەمی دێنا
بمرە لە غەمیدا، کە هەموو سەرفی غەمت بوو!

بەندەی ڕاستەقینەی خودا، دەزانێ ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ مانای چییە!

ئەو دەزانێ، مایەپووچترین کەس، جامیعی دونیایە!

داماوترین کەس ئەوەیە، کە دونیای فانی داوە بە کۆڵیدا!!

چۆن ڕێگا دەدات، دونیا لە عوقبا دووری بخاتەوەو لە زیکرو فیکری تەنها مەحبووبی دڵو ڕووگەی نازونیازی، غافڵی بکات!

هەرگیز ڕێگا بە کاری وەها نادات!!

ڕەحمەتی خودا لە نالی، چەند جوان وەسفی ئەهلی دونیا دەکات:

هەرچەندە کە عومری خزرو جامی جەمت بوو
چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو
ئەی جامیعی دونیاو قیامەت بە خەیاڵات
ئەو ڕۆژە کە مردی، نە ئەوت بوو، نە ئەمت بوو



# نامە نوورییەکان

## نامەی پەنجاوەیەک



# لەگەڵ نامی شاعیردا

شاعیر ناوی عەبدولکەریمی کوڕی محەممەدی کوڕی فەتتاحی کوڕی سلێمانە، لە بنەماڵەی قازییە، ناسراوە بە عەبدولکەریمی مودەڕیسو نازناوی شیعریی "نامی"یە، ساڵی ١٩٠٣ز لە شاری سەیدسادق لەدایك بووە، ساڵی ١٩٠٧، لە تەمەنی چوار ساڵیدا، باوکی کۆچی دوایی کردووەو لەسەر وەسیەتی باوکیو بە چاودێریی دایکی، درێژە بە خوێندن دەدات.

مامۆستا لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتو باشوور، قۆناغەکانی خوێندنی مەلایەتی تەواو دەکاتو ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی مامۆستا شێخ عومەری ناسراو بە "ئیبنولقەرەداغی"دا خوێندوویەتی. ساڵی ١٩٦٠ دەچێتە بەغداو لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی نیشتەجێ دەبێت. ساڵی ١٩٧٤ دەبێتە سەرۆکی ڕابیتەی زانایانی هەموو عێراقو شاعیر زانایەکی شەرعیش بووە، خاوەنی چەندین کتێبو نووسراوەو وێڕای خزمەت بە ئایینی ئیسلام، گەورەترین خزمەتی بە ئەدەبی کوردی کردووەو ڕاڤەی دیوانەکانی نالیو مەحویو مەولەویو سالمی کردووەو هاوکات شاعیرێکی باڵادەست بووەو خاوەنی چەندین دیوانە.

لە بەرواری ٢٠٠٥/٨/٢٩ کۆچی دوایی دەکاتو لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا بەخاك سپێردراوە. ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

گەلێکم هەیە

گەلێکم هەیە لە گەلانی گەل
بۆ جوانمەردی ئەکرێ بە مەسەل
چ لە ڕووی زانست، چ لە ڕووی کردار
چ لە ڕووی پارێز، یا پاکیی ئاسار
بۆ سەخاوەتو غیرەتو مەردی
بۆ شەجاعەتو زیرەکیو وردی
بۆ مەسەل ئەڵێم گەلێکم هەیە
وێنەی ئەفرادی لە دنیا نییە
بەڵام ئەو کاتەی تێکەڵ بن بە یەك
دێتە خوارە پایە بۆ سەد یەك
گەورەیان ناوێ، گەر لە خۆیان بێ
گەر بێگانە بێ، کێ دێ بڵێن بێ!
سیرڕی ئەم وەزعە، ئەوەیە بایین
هەموو داواچیی کڵاوی شایین
گەلێ سادەدڵ، غولامی وەختین
بۆیە بەم پایە، لەگەڵ بەدبەختین
ئەمڕۆ پاش لێدان خەڵاتیان بکەی
ناڕوانە دوێنێو ناڕوانە سبەی

مامۆستا خاوەنی پەندوحیکمەتی ناوازەیە ئەمەش چەند نمونەیەك لەو پەندە جوانانە:

ئینسانی ساغی بەدینو ویجدان
سایەی ڕەحمەتە بۆ ئەهلی جیهان
شەخسی ناساغی دڵ پڕ غەلوغەش
مایەی زەحمەتە بۆ ئەهلی زەمان
* * * * * * * * * * * *
دادی سەرۆکو سەرکاری دەوران
هۆی ئاسایشە ظاهیرو پەنهان
ستەمو جەوری خاوەن دەسەڵات
مایەی مەینەتە بۆ ئەهلی جیهان
* * * * * * * * * * * *
زانای تواناو شاگردی ئەمین
مایەی ڕەحمەتن لە بۆ عالەمین
زانای بێمێشكو شاگردی بەدخوو
مایەی نەگبەتین لە بۆ سەر زەمین
* * * * * * * * * * * *
قەت بایی نەبی بە مەیلی پاشا
بۆ زەردەخەنەی مەکە تەماشا
سەد ساڵ بۆی بمری، کە لێت تووڕەبوو
ئەڵێ: نایناسم، نەمدیوە حاشا
* * * * * * * * * * * *
ئینسانی مادیو شەخسی سیاسی
سەد ساڵ بەگیانو بەدڵ بیناسی
کەی بیری گۆڕا، ئەتهاوێتە بیر
خواە ئەمەوی بی، یاخود عەباسی
* * * * * * * * * * * *
وڵات بێ سەرۆك بەربەرەڵایە
سەرۆکیش بێ داد، دەردو بەڵایە
* * * * * * * * * * * *
ڕانو گاگەلو گەلەی بێشوان
بۆ گورگی ڕۆژە، یا دزی شەوان
* * * * * * * * * * * *
ڕانی بێشوان، بەشی فەنایە
ئەگەر بە گورگە، یا بە سەرمایە